وراگرێن یان :

# مردووخۆرەکان

نەوزاد



## برهان قانع

١٩٨٤

مردنو مردو خواردن لە پێناوی نیشتماندا شانازی یە ..

خۆراگرتن یـان :

# مردوو خۆرەکان

برهان قانع

١٩٨٤

---

مردنو مردو خواردن له پیناوی نیشتماندا شانازی یه ..

ئەوەی بەسەر ئەو شارەدا هات ، هەتــا
هەتایــە نمونەی قارەمانەتــیو گیانــی
خــۆراگریو نیشتمان پەروەری خەڵکی
لینینــگرادە ٠

ـ وەرگێڕ ـ

**پێشکەش بەو کەسانە بێت :**

کە لە رێگای گەلو نیشتمانەکەیانا خۆ
را ئەگرنو لە بەردەم دوژمندا چـــۆك
دادەنێن ٠ ٠

**ـ برهان ـ**
**١٩٨٤**

# پێشەکی :

نیشتمان پەرستی کارێکی سادەو ئاسان نیە ، قوربانی دانو لەخـۆ بوردن لە پێناوی نیشتماندا ئەرکی سەر شانی هەر هاو وڵاتیەکە •

ئەم کتێبە بچکۆلەی لەبەر دەستدایە بەسەرهاتی رۆڵی ئازایەتیو خۆڕاگری خەڵکی شاری لینینگرادتان بۆ ئەگێڕێتەوە ، کە چۆن لە کاتی دووەمـین شـەڕی جیهانیـدا خۆیـان لە رووی لەشـکری داگـیرکاری نازی یەکان راگرتو تا ئەو رادەی مێژوو بـە سەرسامی یـەوە بـۆمـان ئەگێڕێتەوە ، راوەستانو نیشتمانەکەیان نەدا بەدەست دوژمنەوە ، بـا ئەمەش نموونـەی خۆراگریو فیداکاری بـێ بۆ هـەر هاو وڵاتیـەکی ئێمـەش •

مەبەست لە گۆڕینی ئەم کتێبەو چاپکردنی ئەوە نیە بە شانو باڵی کەسدا هەڵبدەین ، هەرچەند شایانی ئەوەشن •• بەڵام مەبەستی سەرەکی ئێمە ئەوەیە ئەو گیانی خۆراگریو نیشتمان پەرستی یەی خەڵکی لینینگراد بێتە سەر مەشقی گیانی خۆراگریو بەرگە گرتنی گەلەکەمان لە هـەر بوارێکی مێژوویی تاڵو پڕ لە ناسۆردا •

نوسەری کتێبەکە « ئاناتۆڵ داروف » خۆی یەکێك بووە لەو مردو خۆرانەی کە لە شەڕەکەدا خۆراگر بـووە(١) • نووسـەر ، باسەکەی وەکو رووداوێك ، یان بەسەرهاتێك بۆ گێڕاوینەتەوە بۆ ئەوەی دەوری هاندەری خۆی ون نەکات ئێمەش هەر بەو شێوەیە کردمان بە کوردی هەرچەند لە چەند شوێنێکدا کورتە دەسکاری‌یـەکی کەممـان کردوە ئەویش نەك بەو رادەیە کار بکاتە سەر تێکدانی مەفهومی باسەکە یـان لە ڕەووشتی وەرگێڕان بچێتە دەرەوە •

نوسەر کتێبەکەی بە چوار بەش نوسیوە ، ئێمەش هەر کردمان بە چوار بەشەوە •• بەڵام هەندێك وشەمان گۆڕیوە بە وشەیەکی تـر ئەویش بۆ ئەوە بووە کە لە سەر زار سوكو ئاسان بێت •

ئیتر پێشەکی سوپاسی هەمو ئەو خوێنەرە بەڕێزانە ئەکەین کـە ڕێزی هەمو بەرهەمێکی ئەدەبی بە رادەی شیاوی خۆی ئەگرن •

**برهان قانـع**

---

(١) پارچە نوسراوێك لە مۆزە خانەی (ئەرمیتاج)دا ئەلیت : لە سەرەتای برسێتی شارەکەدا مشك لە شارەکەدا نەما هەمویان خوران •

## قوناغی خۆ گورج کردنەوەو سەرەتای خــۆ راگرتن

کاتێك شەڕ دەستی پێکردو سپای ئەڵەمان ویستی شاری لینینگراد بگرێ ، خەڵکی شارەکە هەمو تێکڕا زانیان کە نیشتمان‌و شارەکەیـــان کەوتۆتە مەترسی‌گرتن‌و وێرانـــکردنەوە ، بــۆ ئەوەی بــەرگری لەسەر شارەکەیان بکەن بە گورجی کەوتنە خۆ .

خەڵکی روسیە پێچەوانەی خەڵکەکانی ئەوروپای رۆژئاوا ، لەکاتی هەر جۆرە فیداکاری‌یەکدا ئەوەندە خــۆیان سەرقــاڵ ناکەن . . بــۆ بەرگرتن لەسەر پاراستنی شارەکەیان گەورەترین فیداکاری‌یان بەکار هێناوە .

ئەو خەڵکە هەمە جۆرەی ، جگە لەوە بە رەووشت نیشتمـــــان پەروەرن ، ئەیانویست ئەوە بسەلمێنن کە ئەتوانن شارەکەیان بپارێزن‌و شیاوی ئەوەیە هەمیشە بە ئاوەدانی‌و خنجیلانەیی بمێنێتەوەو دانیشتوانی هەمیشە شانازی بە شارستانێتی‌و باری پێشکەوتنیەوە بکەن .

من(١) ، لەو باوەڕەدا بوم ئەگەر سپای ئەڵەمانیەکان لە دووەمین شەڕی جیهانیدا تواناى گرتنی هەر شارێکی تریان هەبایە ، نەیان ئەتوانی ـ وەکو بە خۆیانا رائەبینی یان ئەیان ویست ـ بتوانن ئەو شارە بگرن •• مەگەر تا ئەو رادەی هەمو ژن‌و پیاوانی شارەکەیان سەرجەم بکوشتبایە •

دوای ئەوە شەڕەکە دەستی پێکرد ، من (٢) قوتابی دانشگا بوم ، بە هۆی ئەوەوە تاقیکردنەوەمان تەواو بوبو توانیم بەشداری شەڕەکە بکەم •

لە سەرەتای پەلاماری ئەڵەمانەکانا بۆ سەر شارەکەمان ، فەرماندەی بەرگری شار پێی وتین :

« پێویستمان بە سەرباز گرتن نیە ، بەڵکو هەندێك خەڵکمان ئەوێت بۆ ئەوەی خەندەکێکی قووڵ بە هەر چوار دەوری شارەکەدا هەڵکەنن‌و دەوروبەری شارو شوێنە دەرکەوتووەکان هەمو بکەنە سەنگەر » •

**وە پێی وتین کە ئەبێت :**

« سەرەتای سەنگەرەکان تا رادەیەك لە شارەکەوە دور بێت ، دوای ئەوەش چەندان سەنگەری تر لە شوینە جوربەجورەکانا تا ئەگاتە شار یەك لە پشت یەکترەوە هەڵبکەندرێن •

---

(١) واتا نوسەری کتێبەکە ـ ئەناتوڵ داروف ـ
(٢) هەمان نوسەری کتێبەکەیە ••

ـ وەرگیر ـ

ئێمه(٣) دەستمان کرد بە سەنگەر هەڵکەندن ، کە ئەڵێم ئێمە ، مانای چوار ملێون خەڵکی دانیشتوانی شار (٤) .. ئەمە جگە لەو کرێکارانەی لە کارخانەو فابریقە دەوڵەتی‌یەکانا کاریان ئەکرد ، جگە لەو هەمو ژنو پیاوە پەککەوتەو منالأنەی لە شارەکەدا بون .

قاضی‌ی دادگاو دادوەرو مامۆستای دانشگاو ژنە هونەر پیشەکانو... بە کورتی تێکڕای دانیشتوان هەر لە گەورە ترین بەرێوەبەری دەزگاو دامەزراوەکانەوە تا بچوکترین کار گوزاری دەوڵەت لەگەڵ تێکڕای خەڵك دا ، هەمو ڕۆژ هەر لە بەیانی‌یەوە بە پاچو بێڵو قوڵنگەوە لە شار ئەهاتنە دەرەوەو تا ئێوارە لەو دەشتە خەریکی سەنگەر هەڵکەندن ئەبون .

کرێکاری ئاسایی ڕۆژانە هەشت سەعات کاریان ئەکرد لە ڕۆژێکدا ، بەڵام ئێمە(٥) هەمو ڕۆژێك نزیکەی ١٧ سەعات کارمان ئەکرد . ژنان لە پاش نیو سەعات ئیشکردن ـ یان زیاتر ـ لە سەنگەرەکانا شەکەت ئەبون ، لە جیاتی پرچ شانە کردنو گوڵاو پژاندن بە سەرو لەشیانا هەمو پرچەکانیان بە جۆرێك پڕ بوبو لە خۆڵ کە بە ئاستەم ئەناسرانەوە. هەوای گەرمو تیشکی خۆرگەلێك لەو خەڵکە ئیشکەرانەی شپرزە کردبو . بەڵام کەس گوێ‌ی بە ماندو بونو گەرما نەئەدا .. چونکە ئامادە بون هەمو جوانی‌و خۆشی‌یەکیان بکەن بە قوربانی شارو نیشتمانەکەیان .

لەو کاتەدا ناوشار ئازوخەی تەواوی تیا بو ، هیشتا برسێتی دەستی پێ نەکرد بو ، خەڵك ئەوەندە بە شوێن

---

(٣) واتا خەلکی شاری لینینگراد .
(٤) لەو کاتەدا دانیشتوانی شارەکە چوار ملێون کەس بووە .
(٥) دیـمان مەبەست خەلکی شارەکەیە .. ـ وەرگیر ـ

خۆراکدا نەئەگەڕان ، دەوڵەت فەرمانێکی دەرکردبو کە هەمو شت لەناو بەرن بۆ ئەوەی لە کاتی گرتنی شارەکەدا ــ لە لایەن ئەڵەمانەکانەوە ــ هیچ شتێك نەمێنێت‌و بکەوێتە دەست ئەڵەمانەکان .

ئەمە ، مەبەست ئەوە بو ئەگەر ئەڵەمانەکان هاتنە شارەکەوە نە سوتەمەنی یان دەست بکەوێ‌و نە خۆراك .. ئەم فەرمانە دەقاندەق جیبەجی کرا .

لە دەورو بەری شار کێڵگەی پەتاتەی زۆری تیا بو ، لەو کاتەدا پەتاتەش پێگەیشتبو ؛ ئەگەر بەرێوەبەرانی شار چەن سەد کەسێکیان تەرخان کردبایە پەتاتەی کێڵگەکان کۆ بکەنەوەو لەناو شاردا هەماری بکەن بەو جۆرە برسێتی ئەوەندە خەڵکی نەئەکوشت‌و خەڵك بەو جۆرە لە برسانا شپرزە نە ئەبون‌و نە ئەمردن ..

بەرێوەبەرانی شار بیریان لە ئازوخەی چەند مانگی داهاتووی چوار ملێون خەڵکی شار نە ئەکردەوە ، فەرمانیان دا پەتاتەی کێڵگەکان هەموو لەناو بەرن بۆ ئەوەی ئەگەر شارەکە گیرا نەکەوێتە دەست لەشکری ئەڵەمان .

ئەگەر کەسێك بیبیستبایە کەوا چوار ملیۆن کەس خەڵکی ناوشار ــ جگە لە کرێکاری کارخانەو فابریقەکان کە چەك‌و تەقەمەنی‌یان دروست ئەکرد ــ هەمو لە سەنگەرەکان خەریکی پاچکارین‌و سەنگەری دژی‌تانگ دروست ئەکەن ، سەری سوڕ ئەما کە ئەمانە چۆن‌وە بە چی ئەژین ؟! چونکە لە کاتێکدا هەموو خەڵکی شار هەر لە بەیانی‌یەوە بچنە دەرەوە بۆ سەنگەر هەڵکەندن‌و ئێوارە بگەڕێنەوە بۆ ناو شارو هیچ

کارێکیان نەبێت بۆ دابین کردنی پێداویستی‌یەکانی ژیانیان •• ئەی گوایە بەچی ئەژین ؟!•

یەکێك لە هۆیە گرنگەکانی پاراستنی شار ـ کە لەو کاتەدا دروستیان کرد ـ خەندەکێکی قووڵ بوو بە هەر چوار دەوری شارەکەدا هەڵکەندرا بو ••

من ، لەو باوەڕەدا نیم لە هیچ سەردەمێکی مێژوودا خەندەکێکی بەو جۆرە فراوانو قووڵ بە دەوری هیچ شارێکدا هەڵکەندرا بێت • • تاقیکردنەوەش دەری خست کە ئەو خەندەکە کارێکی تەواو پێویستو بەجێ بو لەو کاتەدا ، چونکە کاتێك لەشکری ئەڵەمان هەموو سەنگەرەکانی دەورو بەری شاریان گرتو گەمارۆی شارەکەیان دا،هەرچەند هەوڵیان دا نەیانتوانی لەو خەندەکەوە بپەڕنەوە بۆ ناو شار •• ماوەی سێ ساڵ لەشکری ئەڵەمانەکان لەو بەری خەندەکەکەوە راوەستان ، تا ئەو کاتەی تێکشکانو دەر کران •

لەو خەندەکەدا لە جیاتی ئاو پڕ بوبو لە خوێن ، لەناو ئەو خەندەکەدا تەنیا مشتێك خاك نەمابو بە خوێنی پەلامار دەران ، یان داکۆکی کاران سور نەبوبێت •• یان نەبوبێت بە قوڕ •

ئەو شوێنەی من سەنگەرم تیا هەڵئەکەند لە نزیك گوندێکەوە بو ناوی « ریباتزکویە » بو ، ئەو دێیە لە کاتی شەڕدا بە تەواوی وێران بو •• بەڵام لەو کاتەدا کە ئێمە سەنگەرەکانمان هەڵ ئەکەند گوندێکی ئاوەدانو خنجیلانە بو •• ژمارەی ئەو خەڵکانەی هاتبون بۆ ئیشکردن ئەوەندە زۆر بون لەسەر ئیشەکە بە ئاسانی جێگامان نە ئەبۆوە • ئیتر

ئەوەمان نە ئەزانی ئەم هەمو خەلـکە لەو دەشتەدا کار ئـەکەین چـۆن هۆیەکانی تەندروستیو ژیان دابین بکەین •

ئێمە بۆ ئەوەی ئیشەکەمان دوا نەکەوێ شەوانە هەر لەوێ ئەماینەوەو نەئەڕۆیشتینەوە بۆ ناوشار، لە دورەوە دوکەڵی دوکەڵکێشی کارخانەکانمان ئەدی •• شەوانە لەناو چاڵو سەنگەرەکانا ئەماینەوە ، ژیانـی ئێمـەش وەکو ژیانی سەربازەکانی ناو سەنگەری لێ هاتبوو ، هەر ئەوەندە جـیا بوین کە ئێمە بێ چەك بوین •• بە ڕۆژدا ژنانو پیاوان پێکەوە کاریـان ئەکرد ، شەوانەش هەر دەستە بە جیا لە سەنگەرەکانا ئەخەوتین •

لە سەرەتادا دوژمن پەلاماری نەداین ، بەڵام لە سەرەتای مانـــگی تەمـوزدا(٦) فـڕۆکە شـەڕ کـەرەکانی ئـەڵەمان بـە تونـدی پەلاماری سەنگەرەکانیان داین • من یەکەمجارم بو کە چاوم لە فروکەی شـــەڕ کەرەوە بێت چۆن بۆمبا فڕێ ئەداتو شەڕ ئەکات •

هەر لەگەل هاتنی فڕۆکەکانی ئەڵەماندا تۆپە تەیارە شکێنە کانمـان کەوتنە دەستڕێژو ئاگر بارانکردنی فڕۆکەکانو دایان گرتن •• ئێمەش وەکو جاران خۆمان لەناو سەنگەرەکانا مت کرد ، پۆلێك فڕۆکەی ئێمە لەگەڵ فڕۆکەکانی دوژمن لە ئاسماندا کەوتنە شەڕەوە ، بەڵام نەیانتوانی فڕۆکەکانی دوژمن دەر بکەنو دور یان بخەنەوە • فڕۆکەیەکی دوژمـن هاتە سەر سەرمان ، هەرچەند لە لایەن تۆپە شەشیرەکانی ئێمەوە تەقەی لێ کرا نەگەڕایەوە ، شتێکی ڕەشی لە سەرمان بەردایەوە ، تمەس بۆمبا بو ، کەوتە ناو سەنگەرەکەی ئێمەوە •• چوار کەسی لێ کوشتینو چەند

(٦) بەرامبەر بە مانگی ژوئیە •

کەسێکیشی بریندار کرد •• کە ئەمەم دی ئینجا لە شەڕو لە ئازاری شەڕ تێگەیشتم •

سەر لە ئیوارەی هەمان رۆژ(٧) دەستەیەك فڕۆکەی تری ئەڵەمانیەکان هاتن ، بەڵام تۆپە فڕۆکە شکێنەکانمان ئەمجارە توانی‌یان یەکێکیان لێ بخەنە خوارەوە ، دوای رویشتنی فڕۆکەکان کچە ئیشکەرەکانی ناو سەنگەرەکان رایانکرد بۆ لای تۆپچی‌یەکانمان‌و ئەملاو ئەولایان ماچ ئەکردن‌و زۆر سوپاسیان کردن •

لە رۆژی سێیەمی مانگی تەموز بە دواوە مەترسی‌یەکی زۆر کەوتە ئیشکردنەکەمانەوە ، چونکە رۆژ نەبو چەندان فڕۆکەی دوژمن نەیەتە سەرمان‌و پەلامارمان نەدەن‌و چەندان ژن‌و پیاومان لێ نەکوژن •

رۆژێکیان شەمەندەفەرێك پڕ بو لە منالّ لە شاری لینینگرادەوە دەرچو ، بۆ ئەوەی منالّەکان لە ئاگری شەڕ دور بخاتەوە ، لەو کاتەدا پۆلێك فڕۆکەی دوژمن هاتن‌و شەمەندەفەرەکەیان بومبا باران کردو سوتاندیان‌و هەمو منالّەکان کوژران ••

هەمو رۆژ ، رۆژی چەند جارێك فڕۆکەی دوژمن ئەهاتنە سەر سەنگەرەکان‌و بە تایبەتی خەندەکەکەیان بومباران ئەکرد •• بەڵام هیچ پەلاماری شارەکەیان نە ئەدا ، لە کاتێکدا کە بە ئاسانی ئەیانتوانی شارەکەش بومباران بکەن‌و هەموی وێران بکەن •

فڕۆکەکانی ئێمە نەیان ئەتوانی بەر لە فڕۆکەکانی دوژمن بگرن ،

---

(٧) هەمان سەرەتای مانگی تەموز ئەگرێتەوە ••

ئێمە نەمان ئەزانی بۆچی دوژمن سەنگەرەکانی ئێمە بومباران ئەکاتو کەچی دەست لە سەربازگاکانی ناو شارو ئەو کارخانانەی چەك دروست ئەکەن ئەپارێزن •

لە دوای شەڕەکە ئەم هۆیە دەرکەوت کە ئەڵەمانیەکان ئەیانویست بێ ئەوەی شارەکە وێران کەن بیگرنو دەست بەسەر هەمو کارخانەکاندا بگرن • ئەڵەمانیەکان وایان دانابو کە بە لای کەمەوە تا روژی ١٥ی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤١ ئەبیت تەواوی شارەکانی ناوچەی ژورروو بگرن ، لەبەر ئەمە بو نەیان ئەویست شارەکە وێران بکەن ، بۆ ئەوەی کاتێك شارەکانیان گرت دەست بەسەر هەمو ئەو کەلوپەلو کارخانانەدا بگرنو تالانیەکانیان لەناو نەچن ، بە تایبەتی کە ئەیانزانی هەمو زێڕی پاشەکەوتەی ولاتی سۆڤیەت لە شاری لینینگرادایە •

ئەو سەنگەرانەی کە ویستمان تـەواو بـون ، ئینجـا چـوین بـۆ شوێنیکی تر ، بۆ ئەوەی سەنگەری دژی تانگ هەڵکەنین • لەو کاتەدا نزیکەی هەشت سەد هەزار کەسێك خەریکی هەڵکەندنی خەندەکە قووڵە کە بون ، هیچ شارێکی تری ئەو ولاتە خەندەکی بەو جۆرەیان بە دەورا نـەکێشرا بـو •

بەلام لە کتێبە مێژووییەکاندا زۆر جار ئەوەم خویندۆ تەوە کە لە سەردەمی کۆندا بۆ پارێزگاری شارە گەورەکان چەندان خەندەکیان بـە دەوری شارەکاندا هەڵ ئەکەند بۆ ئەوەی دوژمن زەفەری پێ نەبات •

ئەو خەندەکە بە هۆی قووڵیو گەورەییەوە توانی رێگای هێرشو پەلاماری ئەڵەمانیەکان ببەستێت ، خەندەکەکە بازنگەیی نەبو ، هێلکەیی

نەبو ، چوار گۆشە نەبو ، لاکێشی نەبوو ... بەڵکو وەکو پشتێنێک بو بەڵام بە شێوەی شکاوە .

سێ ریز سەنگەر لە پشتەوەی خەندەکەکە دروست کرابو ، بـــۆ ئەوەی ئەگەر ریـزی یـەکەمو دووەم گـیران ، ریزی سێیـەم بتوانێت رێگری لە پەلاماری دوژمن بکات . بە جورێك خەندەکەکە هەڵکەندرابو ئەگەر دوژمن لە هەر شوێنێکی دا بیویستبایە پەلامار بدات ئەکەوتە بەر ئاگری دەستڕێژی سەنگەرە پاشکەوانەکان .

لە هەندێك شوێنی خەندەکەکەدا گڵۆپی تیشك هاوێژیان دانابـو کە ماوەیەکی زۆری لـە دوری خەندەکەکەوە رۆشـن ئـەکردەوە . . لێبرسراوان نەخشەی پاراستنی شارەکەیان بەر لە پەلاماری ئەڵەمانیەکان دانابو ، چونکە پێش بینی ئەوەیان کردبو ئەڵەمانیەکان پەلاماری شارەکە ئەدەن . هەر وەکو لە دوای شەڕەکە دەرکەوت کە نەخشەی پاراستنی سەرتاسەری وڵات هەر لە ساڵی ١٩٣٨ ەوە دانرابو ، واتا بە سێ سـاڵ بەر لە پەلاماری ئەڵەمانیەکان . لەو کاتەوە کە ئەڵەمانیا زۆری بۆ وڵاتی جیکوسلوفاکیا هێنابوو داوای ناوچەی « سودت »ی ئەکرد ، کە لە دوایدا بوو بە داوا کردنی تەواوی جیکوسلوفاکیا .

خەڵکی شار بە چەرخو مەکینەی گەورە خەندەکەکەی دەوری شاریان هەڵکەند . یەکێك لە کارخانەکانی شار بە پەلە ژمارەیەکی زۆر مەکینەی گەورەی گڵ هەڵکەندنی دروسـت کردو خستیانـە ئیش . لە پشـــتی خەندەکەکەوە دیوارێکی گڵینی بەرین کە چوار مەترە بەرزاییەکەی بو دروستیان کرد . لەسـەر دیوارەکەوە هەر ماوەیـەك چەندان سەنگەری پاشکەوانی بە زنجیرە تیا دروست کرابو .

لە دوای دروستکردنی سەنگەرەکان تێکڕای خەڵك دەستیان کرد بە هەڵکەندنی خەندەکەکە، نزیکەی دوو ملیۆن ژن‌و پیاو لەو خەندەکەدا رۆژانە ئیشیان ئەکرد • گەلێك لەو ژن‌و پیاوانە لە کاتی ئیشکردنا بـــە بومبای ئەڵەمانیەکان کوژران •• لە رۆژێکدا زیاتر لە ١٠٠ تا ٢٠٠ کەس بـە هـۆی بومبای فڕۆکـەی ئەڵەمانیەکانـەوە ئەکوژران‌و ژمارەیەکیش بریندار ئەبون •

لەو کاتەدا کە خەریکی کارکردن بوین وەکو نیشانەیەکی دیاری فڕۆکەکانی ئەڵەمان وا بوین •• بە داخـەوە فڕۆکەکانی ئێمـە توانـای بەرگیری کردنی فڕۆکەکانی ئەڵەمانیایان نەبو ••

دەوڵـەت ئاگادارینامەی چـاپ ئەکرد کـە گوایە تـا ئێستا هیـچ فڕۆکەیەکی ئەڵەمان نەچۆتە ئاسمانی شارەکەوە ، ئەمە قسەیەکی راست بو چونکە جگە لەفڕۆکە هەواڵدزەکان هیچ فڕۆکەیەکی ئەڵەمانی تا ئـەو کاتە نەچوبونە سەر شاری لینینگرادەوە • ئەمەش لەبەر ئەوە نەبو کـــە تۆپە دژی ئاسمانیەکانی ئێمە رێگایان نەئەدان بەڵکو هەر خۆیان خۆ بەخۆ نەیان ئەویست بچنە ئاسمانی شارەکەوە •

بەر لەوەی هێزەکانی دوژمن بگەنە دەوروبەری شار ئەوەندە لـــە کرێکاران‌و ئیشکەرەکانی ناو خەندەکەکە کوژران کە رەنگی خەندەکەکە ئەرخەوانی بوبو •• لەبەر ئەوەی ئەڵەمانیەکان بە گورجی ئەهاتن ، ئێمە بۆمان نە ئەکرا وەکو چۆن ئەمانەوێ خەندەکەکە تەواو بکەین ، بەڵام توانیـــمان دوو لایەنـی شـار تـەواو کەین‌و رێـگای هاتوچـۆو هاتـنی ئەڵەمانیەکان بگرین ••

روکارێکی تری شارەکە دەریا بو ، ئەوەیان پێویستی بە خەندەك نە ئەکرد ، کاتێك هێزی ئەڵەمانیەکان بەری رۆژ هەڵاتی شارەکەیان گرت ، ئیتر ئێمە نەمانتوانی خەندەکی تیا هەڵکەنین .

هێزە داکوکی کارەکانی شار(٨) ، واتا هێزە بەرگریکارەکان ئاویان نەکردە خەندەکەکەوە ئەمەش لەبەر دوو هۆ بو :

**یەکەم :**

خەندەکەکە ماوەی شەست مەترە پان بو لە هەندێك شوێندا ئەگەیشتە هەشتا مەترە .. پڕ کردنی لە ئاو شتێکی ئاسان نەبو ، ئاوی روباری « نفا » کە بە ناو شاردا ئەرۆیشت بە سەر خەندەکەکەدا زاڵ نەئەبو . هەروەها لە دەریاشەوە پڕ نەئەکرا . لەبەر ئەمە ناچار ئەبون لە ئاوی خواردنەوەی ناو شارەکە خەندەکەکە پڕ بکەن ، کە ئەمەش کارێکی زۆر گران بو . چونکە خەڵکی شار بێ ئاو ئەبون لەو هاوینەدا جگە لە مەینەتی شەڕەکە دوچاری چەندان جۆر نەخۆشی ئەبوون .

**دووەم :**

لەبەر ئەوە بو ، ئەگەر پڕ بکرابایە لە ئاو دوژمن بە ئاسانی ئەیتوانی پردی بەسەردا ببەستێ و بەسەریا بپەڕێتەوە بۆ ناو شارەکە ..

---

(٨) ئەو هیزە گەلییانە بون کە بوبونە پشتیوانی هیزە سەربازییەکان..

بەڵام پەڕینەوە لە خەندەکێکی بێ ئاو کارێکی زۆر گران بو •

دیوارەکانـی خەندەکەکە وەکو کـوڵەکە وەستابـون ، تەنانـەت پشیلەش بە ئاسانی نەیئەتوانی بە سەریا سەرکەوێتـە سـەرەوە ، جـگە لەوەش چەنـدان سەنـگەری پاشکەوان کە بـە سـەر خەنـدەکەکەدا ئەیانڕوانی دروستکرا بون • بەو هۆیەوە سپای ئەڵەمان توانایان نەبو بێ بخەنە ناو خەندەکەکەوە •

جگە لەو هۆیانەی لە سەرەوە باسکران ، دوای ئەوە کە گەمارۆدانی شارەکە درێژەی کێشاو زستان هاتە پێشەوە ئەو جار دەرکەوت کە ئـاو نەکردنە خەندەکەکە کارێکی ئاقڵانە بو ، چونکە ئەگەر خەندەکەکـە ئاوی تیا بوایە زستان ئەبوو بـە سەهۆڵو بـە ئاسانی دوژمـن بـە سەریا ئەپەڕینەوە بۆ ناو شار •

لەشکری ئەڵەمان دوای ئەوە لە هەمو ناوچەکانی ئەوروپا سەرکەوت کاتێك بەو خەندەکە گەیشت نەیتوانی بڕوات • بە پێچەوانەی نەخشەی ئەڵەمانیەکان پەلامارەکەیان بـۆ سـەر شاری لینینـگرادو وەکـو خۆیان ئەیانویست داگیر کردنی وەستا • لەگەڵ ئەوەشدا لە هەمو ناوچەکانـی ترا سەرکەوتبون تەنانەت گەیشتبوونە روباری « ڤولگا »و پێیان نابـوە شاری ( تزاریت زین )ی کۆن کە لە دوایدا ناونرا « ستالینگراد » • بەڵام هەرچەند هەوڵی دا نەیتوانی بچێتە ناو شاری لینینگرادەوە •

لە کاتی هەڵکەندنی خەندەکەکەدا زۆر جار ئێسقانی مردو لە ژێر خاکەوە ئەدۆزرایەوە ، هاوڕێکانم ئەیانووت شاری «بطرس بورگ»(٩)

---

(٩) یان « پتربورگ » ••

لەسەر ئێسقانی ئەو کرێکارانە بونیات نراوە کە لە کاتی کردنەوەی شارەکەدا مردوون •

دوای ئەوەی پەلاماری گشتی ئەڵەمانیەکان دەستی پێکرد ، ئەمانووت ئێمەش ئەمرینو جارێکی تر لەسەر ئێسقانی ئێمە شارەکە بونیات ئەنرێتەوە •

سەرۆکی بنەماڵە ئاینییەکان ، یان یەکێتییە مەزهەبییەکان ، چەندان نوسراویان بە دیوارو شوێنە گشتییەکانا هەڵواسیبو کە نوسیبویان :

« رۆژی راپەڕینە ، مەسیح لەسەر چیا بەرزەکان وەستاوە ، خۆتان بۆ پێشوازی مەسیح ئامادە بکەن ، تۆبە بکەن ، لە خوا بپاڕێنەوە بەڵکو خواوەند بتان بەخشێت » •

هەندێك جاریش ئاگاداری نامە بە ناوی سەرۆکی ئەنجومەنی شارەوە دەر ئەچو ، داوای لە خەڵك ئەکرد چاوەڕوانی سەرکەوتن بن •

خەیارو تەماتەو پەتاتەو نانو شەکرو چاو هەمو جۆرە ئازوخەیەك ـ تارادەیەك ـ لەو کاتەدا زۆر بو • بەڵام گۆشت نەبو ، یان ئەگەر هەبایە زۆر دەگمەن بوو • خەڵکی شار لە جیاتی گۆشت تەماتەو بیبەریان پێکەوە ئەبرژاندو ئەیانخوارد • تا کۆتایی مانگی تەموز نە هەست بە برسێتی ئەکراو نە بە کەمی ئازوخە لەناو شاردا •

لە سەرەتای مانگی ئابی ساڵی ١٩٤١ دا گۆشت زۆر نایاب بو ،

تەنانەت بە هیچ جۆریك‌و لە هیچ لایـەکی شاردا دەسـت نەئەکەوت • دوای ئەوەش دەسەندەی نانی رۆژانەش کەم بۆوە ، بەڵام دانەوێڵە ـ بە تایبەتی ماش‌و نیسك‌و پەتاتە ـ هێشتا زۆر بو •

لە نیوەی یەکەمی مانگی ئابدا دانەوێڵەش بەرە بەرە کەم بۆوە ، بە جۆرێك لە کۆتایی ئابدا گەیشتە رادەیەك نە پەتاتەو نە تەماتەو نەماش‌و نە نیسك‌و نە هیچ جۆرە دانەوێڵەیەکی تر دەست نەئەکەوتن •

یەکێك لە مامۆستایانی دانشگا ـ ئەگەر چی بە تەمەن زۆر پیر بو خەریکی سەنگەر هەڵکەندن بو لەگەل ئێمەدا ، روژێك لە کۆتایی مانگی ئابدا ، کاتێك کە مەنجەڵێك نیسکێنەمان لێ نابـو خەریـکی نان خواردن بوین لەناو سەنگەرەکانا وتی :

« کورەکان ! نرخی ئەم نیسکێنەیە بزانن ، وەکـو من هەست ئەکەم ئەمە دوا نیسکێنەیەکە بیخۆین »

کـــە نیسك تـەواو بو ئینجـــا دەسەندەی نان بەشی نەئەکردین‌و تێرمان پێ نەئەخوارد ، ئیتر لەو رۆژە بەدواوە نیسك‌و ماش‌و هیچ جۆرە دانەوێڵەیەکی تر لە شاردا نەما تاکو لێ بنرێن •

یەکەمجار لە مانگی ئەیلولدا هەستم بە برسێتی کرد(١٠) ، خەڵکێکی زۆریش وەکو من برسی بون‌و بە شوێن خواردندا ئەگەڕان ، وتیـــان لە یەکێك لە شەقامەکانی شاردا هەمو جۆرە خواردنێك هەیە •• تەنانەت گۆشتی « گا » ئەفرۆشن • رۆیشتم بۆ شەقامەکە لە یەکێك لە دوکاندارە

---

(١٠) بە زمانی نوسەری کتێبەکەوە وتراوە •

کانم پرسی ئەویش وتی هەمو شتێکم هەیە بەڵام بە زێڕ ئەیفرۆشم ، وتم ئەی بۆچی بە « ئەسکەناس »ی نافروشی(١١) ؟ وتی « ئەسکەناس»ی روسی ، ئەویش وەکو « منات »ی تزاری‌یەکانی لێ دێتو بەهای نامێنێت (١٢) •

لە یەکەمین شەڕی جیهانیدا هیچ کەس بیری لەوە نە ئەکردەوە کە « منات »ی تزاری هەرگیز دوچاوی نوشوستی ئەبیتو لە بازارەکانی ناو خۆو دەرەوەدا بەهای خۆی ئەدو ڕێنێ •• بەڵام لە دوایدا وای لێ هات کە بچوکترین ئەسکەناسیان بە (٥٠٠) پێنج سەد هەزار « منات » ئەچو •

من ، ئیتر لەو کاتەوە تێگەیشتم کە بازرگانو دوکاندارەکان لە دوا رۆژی ئەسکەناسی روسی ئەترسنو لەو باوەڕە دان ئەویش نرخی نامێنێت •

مامۆستایەکی دانشگاکەمان کە بیستی لە بازاڕی رەشدا پارەی ئەسکەناسی روسی وەرناگیرێت وتی :

« من ، ئیتر نامەوێ بژیم ، بەڵام لەگەل ئەوەشدا دڵنیاتان ئەکەم کە وڵاتەکەمان ئەم شەڕە نادۆڕێنێو هەر سەرکەوتو ئەبیتو هەر سەر ئەکەوێت » •

لە سەرەتای مانگی ئەیلولدا برسێتیو پەلاماری ئەڵمانیەکان

---

(١١) پارەی روسی ئەو سەردەمە بوەە •• کە مامەڵەی پێکراوە •
(١٢) منات •• لە کاتی یەکەمین شەڕی جیهانیو بەر لە سەرکار لا چونی تزاری‌یەکان لە زوربەی بازارەکانی دەرەوەو ناو خۆدا بەهای نەما •

هەردوکیان بە یەکجارو لە هەمو لایەکەوە دەستیان پێکرد • هێزی زۆری دوژمن لە رۆژ ئاوای شارەوە زۆر بە توندی پەلاماری شارەکەی ئەدا •

ئەڵەمانیەکان ــ هەر چۆن بو ــ توانی‌یان بە هۆی تانگ‌و چەکی قورس‌و زرێپۆشەکانیانەوە ئەو سەنگەرانە بگرن کە لە دەرەوەی شار هەڵکەندرابون ، لە سەرەتاوە ویستیان پرد بەسەر خەندەکەکەی دەوری شاردا ببەستن ، بەڵام ئەو دەستە سەربازیانەی هاتبون بۆ بەستنی پردەکە هەمویان کوژران •

پاش چەند رۆژێك هەمو ئەو لاشە کوژراوە ئەڵەمانیانەی لەسەر خەندەکەکە کوژرابون بۆگەنیان کرد ، ئەڵەمانیەکان نەیان ئەتوانی لاشەی سەربازە کوژراوەکانیان لە خەندەکەکە دەر بکەن‌و بیان بەنەوە • دوای ئەوە لە بەستنی پرد دڵنیا بون کە بۆیان نابەستریێ‌و توانای ئەمکارەیان نیە ، ئینجا ویستیان دیواری پشتیوانی خەندەکەکە بشکێنن ، بەڵام لە سەنگەرەکانی پشت خەندەکەکەوە درانە بەر دەستڕێژو ژمارەیەکی زۆریان کوژراو زۆریان لێ بریندار بوو ئەوانی تریشیان هەڵاتن‌و پاشەکشەیان کرد •

لە کاتێکدا ئەڵەمانیەکان لە بەری رۆژئاوای شارەکەوە خەریکی خۆ رێکخستن‌و پەلاماردان بون ئێمەش لە لای رۆژهەڵاتەوە خەریکی هەڵکەندنی خەندەك‌و دروستکردنی سەنگەرو قایم کردنی دیواری سەر خەندەکەکە بوین • دوای ئەوە خەندەکەکە لە هەمو لایەکەوە هەڵکەندراو بە ئەندازەی پێویست تەواو بو ، ئەو کاتە خەڵکی شار هەموو دڵنیا بون کە ئیتر دوژمن ناتوانێت لەناکاو دزە بکات‌و پەلاماریان بدات‌و زەفەریان پێ ببات •• ئەڵەمانیەکان زۆر جار تاکتیکی تازەیان بۆ پەلامار

بردن دائەناو ئەیانویست پەلاماری شارەکە بدەنو شارەکە داگیر کەنو دەست بەسەر هەمو ئەو کارخانەو فابریقەو دەزگاو دامەزراوە ئابوری‌یانەدا بگرن کە لە شارەکەدایە ، بەلاّم هەمو جار هەر تێک ئەشکانەوە •

لە دوەم رۆژی مانگی ئەیلولدا لەشکرێکی زۆری چەتربازی ئەڵەمانی لەناکاو لە پشت سەنگەرە بەرگری‌یەکانەوە دابەزین • بەلاّم بێ ئەوەی بتوانن هیچ رواڵەتێکی شەڕەکە بگۆڕن هەمویان کوژران • ئەڵەمانیەکان چونکە ـ بەر لەوە ـ چەند شوێنێکیان بە رێگای چەتربازی داگیر کردبو بەوە دەسخەڕۆ بونو ژمارەیەکی زۆر زەلامی موقەبایی‌و پلاستیکی‌یان بە چەتر لە پشتی سەنگەرەکانەوە دابەزان ، بۆ ئەوەی خەڵکی شارەکە بخلەتێنن ، بەلاّم هێزە بەرگریکارەکان(۱۳) هەڵنەخلەتان • لە یەکەم پەلاماردا بۆ سەر چەتربازەکان هەمویان کوشتن •

دوای ئەوە ، ناوبەناو چەند جارێکی تر ئەڵەمانیەکان هێزی چەتر بازیان لە پشت سەنگەرەکانەوە دابەزاند • بەلاّم هێزە بەگریکارەکان دەمودەس لە سەریان ئامادە ئەبونو لەناویان ئەبردن •

لە واقیعدا لە شەڕی [ پولەندە ـ لهستان ] مانگی ئەیلولی ساڵی ۱۹۳۹ ـ ولە شەڕی فەرەنسە ـ لە مانگەکانی مایس‌و حوزیرانی ساڵی ۱۹٤۰و شەڕی دورگەی کرت ساڵی ۱۹٤۱ ، هێزە چەتربازەکانی ئەڵەمان سودێکی زۆریان لە چەند پەلامار بردنیکی لەناکاوی دا وەر گرت‌و توانی‌یان بەو هۆیەوە هێزەکانی دوژمن لەناو بەرن ، بەلاّم ئەم تاقیکردنەوەیان بۆ گرتنی شارەکە بۆ نەچووە سەر •

---

(۱۳) ئەو هیزە تیکەلاّوانە بون کە لە هیزی بەرگری میللی‌و سەربازەکان پێك هاتبون •

دوای ئەوە کە ئەڵمانیەکان تێگەیشتن ناتوانن بە رێگای هێزە چەتر بازەکانیانەوە بچنە ناو شاری لینیگرادەوە جارێکی تر باری تاکتیکی شەڕیان گۆڕیو بە تەواوی ئەڵقەی گەمارۆدانەکەیان توند کرد ، بەو نیازەی تاکو لە رێگای نەبونی خۆراكو ئابڵۆقەی ئابوریو برسێتی یەوە خەڵکی شارو هێزە بەرگریکارەکانیان لەناو بەرن •

تا روژی ٢٥ی مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٤١ ئیستگەی رێگای ئاسنی « مگا » مان بە دەستەوە بو ، لەوێوە بە رێگای ئاسن‌دا هاتوچۆمان ئەکردو پەیوەندیمان لەگەل ناوچەکانی تری وڵاتدا هەبو • بەڵام روژی ٢٥ی مانگی ئەیلول ئەڵمانیەکان پەلاماریان بردە سەر ئیستگەکەو داگیریان کردو هەمو پاسەوانەکانی ئیستگەکە کوژران • لەو کاتەوە ئیتر بە تەواوی ئەڵقەی گەمارۆدانەکەی شار توند تر بو • ئیتر لەو کاتە بە دواوە توانامان نەما هیچ جۆرە خۆراکێك لە دیوی دەرەوەی خەندەکەکەوە بهێنین بۆ ناو شارو بە تەواوی هەمو جۆرە پەیوەندی‌یەکی هاتوچۆ کردنمان لەگەل دەرەوەدا بچڕا •

لیژنەیەك بۆ سەرژماری ئازەوخەی ناو شارو سەرپەرشتی کردنی بەکار هێنانی رێك خرا ، کە یەکێك لە ئەندامەکانی ئەو لیژنەیە فەرماندەی بەرگری شارەکە بو ، ئەویتریان سەرۆکی شارەوانی بو لەگەل چەند کەسێکی ترا •••

ئەم لیژنەیە پاش سەردانی سایلۆکان بۆیان دەرکەوت کە چوار ملیۆن کەس لەناو شاردا هەیە تەنیا شەش هەزار تەن گەنمیش لە سایلۆو هەمارەکانی دەوڵەتدا هەیە •• واتا ئەگەر هەر یەك لە دانیشتوانی شار رۆژی نیو کیلۆ نان دەر بگرن ئەو کاتە بەشی تەنیا دوازدە رۆژی خۆراکی خەڵکی شارەکە ئەکات •

ئەگەر زیاد لەو رادەیە گەنمو خۆراك لە شارەكەدا هەبایە مەترسی برسێتی ئەوەندە نە ئەبو .. رەنگ بێ هەندیك كەس لە ماڵەوە هەندیك گەنم یان شەكرو چاو خۆراكی تریان هەبایە ، بەڵام ئـەوە بە ئازوخەی شار دا نەئەنرا .

باری شەڕ لە هەمو بەرەگاكانی شەڕدا وەكو یـەك خراپ بو ، چـونكە ئەڵمانیەكـان زۆر بـە گورجـی سەركەوتنیان بە دەست ئەهێنا . هەندێك لەو باوەڕەدا بون كە ئەڵمانیەكان بەر لە تەواو بونی زستان هەمـو شارەكانی تری وڵات ئەگرێتو لە لای خواروشـەوە ئەگاتە روباری « ڤولگا » .

هەندێكی تریش لەو باوەڕەدا بون ـ كە هەر چۆن بێت ـ هەندێك لە شارە گەورەكان خۆیان رائەگرن ، بەڵام زوربەی خەڵك بە تەواوی لەو باوەڕەدا بون كە هەرگیز ئەڵمانیەكان ناتوانن گەمارۆدانەكەی شـاری لینینگراد بشكێنن . هەندێكیش تا رادەیەك گەشبین بون ئەیانووت لـەم بەهارەدا كە بەفرو سەهۆڵەكان توانەوە دەوڵەت شارەكەمان لە گەمارۆدانی دۆژمن رزگار ئەكات .

لەو كاتەدا ژمارەی دانیشتوانی شار چوار ملیۆن كەس بو ، هـەر بۆ ماوەی (٩) نۆ مانگ شەش سەد هەزار تەن گەنمی پێویست بو ، تاكو دەوڵەت ئەتوانێ ئەو گەمارۆدانە بشكێنێ .. ئەگەر لە ماوەی نۆ مانگدا هەر یەكێك لە دانیشتوان رۆژی نیو كیلۆ نانی پێ بدرابایە ئەبـوا پێنـج سەدو چل هەزار تەن گەنم هەبایە ئینجا بەشی ئەكرد .. لە هەمارەكانـی

دەوڵەت دا جگە لەو شەش هەزار تەنە گەنمە هیچ جۆرە دانەوێڵەیەك یان شەکرو چا یان هیچ جۆرە خۆراکێکی تر نە لە سایلۆکانی دەولەتو نە لە بازارەکاندا نەبو •

لە مانگی ئەیلول بە دواوە جگە لە نانی وشکی هیچ جۆرە خواردەمەنیەکی تر نەما •• ئەگەر لە کاتی خۆیا هەمان پەتاتەو ماشو، نۆكو نیسکەی ناوچەکانی دەوروبەری شار کۆ بکرابانەوەو بەرێكو پێکی دابەش کرابانایە بەرگیری لە برسا مردنی سێ ملیۆنو شەش سەد هەزار کەسی خەڵکی شارەکە ئەکرد •• ئیتر بەو جۆرە نە ئەبو کە لە سەر ژماری چوار ملیۆن کەس دانیشتوان سێ ملیۆنو نیویان لە سەرماناو لە برسانا بمرن • گوناحی ئەمەش لە ئەستۆی لێپرسراوانی ئەو سەردەمەی شار بوو کە چارەنوسی ئەم خەڵکەیان دایە دەست سروشت •

دوای ئەوەی سەرژماری هەمو ئازوخەی شارەکە کرا ، بڕیار درا هەر کەسێك رۆژی (١٥٠) سەدو پەنجا گرام نانیان بدرێتێ • لەبەر ئەوەی لەناو شاردا هیچ جۆرە خواردەمەنیەکی تر نەبو ، خەڵکی ناچار بون بەو سەدو پەنجا گرامە نانە قنیاتیان بکردبایە •• تا ئەو کاتەی خەڵك بە هیوای ئەوە بون خواردەمەنی تریان دەست بکەوێت ، مەترسی ئەوەندە نەبو • بەڵام کە دڵنیا بون رۆژی لە سەدو پەنجا گرام نان زیاتر هیچ خۆراکێك بە دەست ناکەوێت ئینجا ترسان • تەنانەت ئەو کەسانەی لەبەر قەڵەوی دوچاری نەخۆشی فشاری خوێن بوبونو تەنیا رێگای چاك بوونەوەیان پارێز کردنو برسێتی بو ئەوەندە برسیان بوبو هەمو دوچاری نەخۆشی برسێتی بوبون •

ئێمە ئەوکاتە نەمان ئەزانی ئەو سەدو پەنجا گرامە نانە ئەبێتە سەد گرامو ئینجا ئەبێتە حەفتاو پێنجو دوا جار ئەبێتە پەنجا گرامو تاکو بە یەکجاری نامێنێ •• وردە وردە دەنگوباس لە شاردا بلاو بۆوە کە دەسەندەی رۆژانەی نان لەو رادەی ئێستا کەمتر ئەبێتەوە ، خەلك بە گورجی باوەڕیان بەم جۆرە هەوالانە ئەکرد ، چونکە زەمینەی باوەڕ کردن بە کەمبوونەوەی دەسەندەی نان زۆر لەبار بو • رۆژی دوایی دەسەندەی نانی رۆژانە بوو بە سەد گرام •• بۆ ئەوەی خەلك ورە بەرنەدەنو خۆ راگر بن لێپرسراوانی شار ئەوەیان راگەیاند کە لە دوا رۆژدا دەسەندەی نان لەم رادەی ئێستا کەمتر ئەبێتەوە •

ئەمە لەو کاتەدا بو کە یەکەمجار هەوری پایز بەری ئاسمانی گرت • لەو کاتەدا هێشتا رۆژنامەکانی ناو شار دەرئەچوو(١٤) ، چونکە دەزگای کارەبا کاری ئەکردو رادیوش هەبو •• خەلك بە هۆی رادیۆوە ئاگاداری هەمو هەوالێکی ناو شارەکە ئەبو ، بە تایبەتی هەوالی کەمبونەوەی دەسەندەی نانی رۆژانە کە لە هەمو شت زیاتر باس ئەکراو ئەهمیەتی ژیانی هەبو • یان لە رۆژنامە کانا ئەیانخوێندەوە •• مەسەلەی کەمبونەوەی دەسەندەی رۆژانەی نان کارێکی زۆری کردە سەر گیانی خۆراگریانەی خەلك •

لەو باوەڕەدا نیم تا ئەو رۆژە خەلك دەستیان بە خواردنی گۆشتی گیانلەبەرە حەرامەکان کردبێت وەکو : کەرو سەگو پشیلەو •••• بەلام کە دەسەندەی نان بو بە سەد گرام لە رۆژێکدا خواردنی سەگو پشیلەو

---

(١٤) لەو کاتەدا بەهۆی باری شەڕەکەوە تەنیا دوو رۆژ نامەی بچوك لە قەوارەی دەفتەری بەرباخەلدا دەر ئەچون •

کیانلەبەرە حەرامەکانی تر شان بەشانی ئەو کەمبونەوەیە دەستی پێکرد • نەك زوربەی خەڵك بەڵکو تەواوی خەڵك بە زۆری هەر بیریان لە خواردن ئەکردەوە •

زۆر جار بیرم لە رابوردو کاتی ئاسایی ژیان ئەکردەوە کە چۆن لە چێشتخانەیماڵەوە کاتێك مناڵ بوم دایکم چەندان جۆر خواردنی بۆ دا ئەنامو منیش بیانووم ئەگرت •• یان نەختێك گۆشتو پەتاتەو ماشم ئەخواردو ئەرۆیشتم ••

لە بیرم دێت زۆر جار دایکم گلەیی لای دراوسیکانمان ئەکرد ئەیووت « [ ئاناتول ] خواردنی پێ ناخورێت ئەترسم لەم شت نەخواردنەی دوچاری نەخوشیەك بێت » •

تا ئەو رۆژەی کارەبا ئیشی ئەکرد رادیۆ هەبو ، ئاگاداری هەواڵە کانی ناو خۆو دەرەوە بوین ، روژنامە هەبو ، خەڵکی بەهۆی رادیۆو رۆژنامەوە لە هەواڵی شەڕ ئەگەیشتنو باسی شەڕیان بۆ یەکتر ئەگێڕا یەوە • هەر لەو رۆژانەدا بە هۆی نەبونی کەرەسەی سوتەمەنییەوە دەزگاکانی کارەبا لە کار کەوتنو کارەبا وەستا • رادیۆ لە کار کەوت ، ئیتر رۆژنامە دەرنەچو ، هیچ جۆرە هەواڵێکی شەڕمان لە هیچ لایەکەوە پێ نەئەگەیشت • ئەگەر ئێمە لە هەواڵی بەرەکانی تری شەڕ ئاگادار بوینایە یەکجار ئەوەندە نەئەترساین •• چونکە مرۆڤ هەرچەند برسی بێت ئەگەر ئاگاداری هەواڵی ناوخۆی ، خۆیو دەرەوەو ، وڵاتەکەی خۆی بێت ئەوەندە ورەی دانائەبەزێو ورەبەرنادا •

**بـۆ نمونـه :**

ئه‌گه‌ر کاره‌بامان هه‌بایه‌و رادیۆ کاری بکردایه هه‌واڵی ئه‌وه‌مـان ئه‌زانی کاتێك ئه‌ڵه‌مانیه‌کان په‌لاماری وڵاته‌که‌یان داین ده‌وڵه‌تی ئینگلیـز بڕیاری داوه له ڕێگای ژوروی ئه‌وروپاوه ئازوخه‌و چه‌کو هه‌مو جـۆره مه‌کینه‌یه‌ك بۆ روسیا بنێرێت • وه له ڕێگای به‌نده‌ری « مورمانسك »ه‌وه که که‌وتۆته لای ژوروی وڵاته‌وه پێمان ئه‌گات • ئه‌گه‌ر هه‌واڵی ئه‌وه‌مان بزانیبایه که یه‌که‌مین کاروانی که‌شتی ئینگلیزه‌کان له ژوروی ئه‌وروپاوه هـاتووه‌و گه‌یشتۆته به‌نده‌ری « مورمانسك » ئێمـــه‌ش خۆ راگرترو وره به‌رز تر ئه‌بوین‌و هیوامان به دوا ڕۆژمان گه‌ش تر ئه‌بو •

ئێمه له سه‌ره‌تای شه‌ڕه‌که‌دا ئه‌وه‌مان بیستبوو که ده‌وڵه‌تی ئینـگلیز یارمه‌تمان ئه‌دات ، به‌ڵام ده‌زگا راگه‌یاندنه کانی خۆمان ئه‌وه‌نده به خراپ باسی ده‌وڵه‌ته سه‌رمایه‌داری‌یه کانیان کردبو که بڕوامان نه‌ئه‌کرد ده‌وڵه‌تێکی سه‌رمایه‌داری وه‌کو ئینگلیز راستمان له‌گه‌ڵا بکات‌و یارمه‌تمان بدات •

ئه‌گه‌رچی له یه‌که‌مین شه‌ڕی جیهانیدا ، ده‌وڵه‌ته‌کانـی فه‌ره‌نسـه‌و به‌ریتانیا یارمه‌تی روسـیایان دا ، به‌ڵام لـه‌و کـاته‌دا روسـیا ده‌وڵه‌تێکـی ئیمپه‌راتوری‌و سه‌رمایه‌داری بو نه‌ك وه‌کو ئیستا ده‌وڵه‌تێکی سوشیالیتی •

**ئه‌وانه‌ی خاوه‌نی تاقیکردنه‌وه بون ئه‌یانوت :** « مه‌به‌ستی ئینگلیزه‌کان له‌مه‌دا ـ گوایه یارمه‌تی روسیا ئـه‌ده‌ن ـ ته‌نیا بۆ کات بردنه سه‌ره » •

به‌و جۆره‌ی که فه‌ره‌نسه له ماوه‌ی چه‌ند هه‌فته‌یه‌کدا له‌ناو چـو ، روسیه‌ش هه‌ر به‌و جۆره له ماوه‌یه‌کی که‌مدا له‌ناو بچێت‌و دوایی بڵێن :

« تاکو ئێمە کەلوپەلو ئازوخەو چەكو تەقەمەنیمان لەسەر کەشتی‌یەکان بار کرد شەڕەکە تەواو بو ، چونکە ئەوانە وا ئەزانن کە روسیا وەکو فەرەنسە وایە لـــە ماوەی شەش هەفتەدا لەناو بچێت » ئیتر ئەوە نازانن کە خەڵکی ئێمە خەڵکێکی خـاوەن تاقیکردنـەوەو خـــۆ راگرن •

ئێمەش کە تاقیکردنەوەمان کەمبو ، نەمان ئەزانی چۆن بیر بکەینەوە ، بەڵام ئەگەر بمان زانیبایە دەوڵەتی بەریتانیا کاروانی دەریایی ناردوە بـۆ بەندەری « مورمانسك » و خەریکی داگرتنیەن •• هێوامان بـەرز تـر ئەبۆوە •

یەکێکی تر لەو روداوە گرنگانەی کە ئێمە ئاگادار نەبوین ئەوە بو دەوڵەتی ئەمەریکا تێکەڵاوی شەڕەکە بوبو • دەوڵەتی ئەمەریکا لە مانگی کانـونی یەکەمـی ساڵی ۱۹٤۱ دا لـە دوای پەلامـاردانـی بەنـــدەری « پیرل‌هاربور » لە لایەن ژاپۆنەوە لە ئوقیانووسـی ئارامداو نوقم کردنی چەندان کەشتی ئەمەریکایی لەو بەندەرەدا تێکەڵاوی شەڕەکە بوبو •

ئێمە ئەمانزانی لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا چونی ئەمەریکا بۆ ناو شەڕەکە بوو بە هۆی بە خێرایی سەرکەوتنی بەرەی هاو کارەکـان •• ئەگەر ئێمە بەو هەواڵەمان بزانیبایە ئەمانزانی شەڕی نێـوان ئەمەریکـاو ژاپۆن بە مانا هاریکاریکردنە لەگەل ئێمەدا ، وە ئەم هاریکاری‌یە دەورێکی کاریگەرانەی ئەبێت لەبەر ئەوەی ئەمەریکاو ئینگلیـز هێـزی دەریایـی زۆریان هەبو •

ئەمرۆکە(١٥) من پیاوێکی ئیختیارمو چومەتەساڵەوە ئاگام لە باری جۆنێتی دەرەوە ــ واتا دەرەوەی وڵات ــ هەیە ، ئەوە ئەزانم کە لەو کاتەدا دەوڵەتی ئەمەریکاو ئینگلیز هەرچەند هێزی دەریاییان زۆر بەهێز بـۆ نەیان ئەتوانی هێزەکانی خۆیان بگەیەننە دەریای « بالتیك »و شارەکەمان لەو گەمارۆدانە رزگار بکەن ، چونکە شارەکەمان کەوتۆتە کەناری دەریای « بالتیك »و رۆژهەڵاتی دەریاکەوە ٠

بەڵام لەو کاتەدا هەر بە بیستنی هەواڵی چونە ناو شەڕی ئەمەریکاوە هیوایەکی بەرزمان بە دوارۆژ پەیدا کرد ٠

کاتێك دەسەندەی نان گەیشتە رۆژی (٧٥) حەفتـاو پێنـج گـرام سەرمای زستانی ١٩٤١ یش دەستی پێکرد ، بەر لەوەی سەرما زۆر بێت خەڵکی شار هەمو دارو درەختەکانی نزیك شاریان سوتاندبو ، بە جۆرێك کە لە کاتی سەرماکەدا خەڵك هیچ جۆرە سوتەمەنی یەکیان نەبو ٠ خەڵکی بە ناچاری و لەبەر سەرما دەستیان کرد بە سوتاندنی دەرگـاو پەنجەرەو کەرەسەی تەختەی ناو ماڵو ٠٠٠ لەو کاتەدا بە هۆی سەرماو برسێتی‌یەوە خەڵك ئەمردن(١٦) ٠

---

(١٥) کاتی نوسینی کتیبەکەیە ، وا دەر ئەکەوێ ماوەیەك دوای شەڕەکە ئەم کتێبە نوسراوەتەوە ٠

(١٦) کاتی سەرەتای وەرزی ، مردنی خەڵکە لەبەر سەرماو برسێتی ٠٠

بەر لەوەی هەمو هۆیەکانی رۆشنی لەناو بچن شەقامەکانی ناو شار وەکو شەوی شەڕیان لێ هاتبو ، بەڵام لە ژوری ماڵەکاندا کەم تا زۆر و لە هەندێک ماڵدا چرا دائەگرسا ،

لە زستانی ساڵەکانی ٤١ ـ ١٩٤٢ دا هەموو ماڵەکانی شار بێ چـرا کەوتن و شەوانە بە تاریکی دائەنیشتن ، ئەوانەی توانایان هەبو لە مـاڵ ئەچونە دەرەوە بۆ ئەوەی دەسەندەی نانی رۆژانە یان وەر بگرن،ئەوانەش کە توانای چونە دەرەوەیان نەمابو لە جێگای خۆیانا ئەمانەوە تا وەکو لـە برسانا ئەمردن •

هەمو دوکان و کارخانەو فابریقەو دەزگاو دامەزراوەکانی دەوڵەت داخرا بون ، چونکە برسێتی ماوەی ئەوەی نەئەدا کەسێک بتوانێت بـە کارێکەوە خەرێک بێت و کارێک بکات •

هەرکەس لە شار بۆ خۆی ئەژیاو هەوڵی ئەوەی ئەدا لە سـەرماو برسێتی دا نەمرێت ، سەر شەقامەکان خامۆش بون ، شوێنە گشتی‌یەکان بێ ناز بون ، ئەو کەسانەی لەسەر روخی شەقامەکان لە سەرما یـان لـە برسانا ئەمردن کەسێک بە هاناو هاواریانەوە نە ئەچۆ •• هەرکەس لـە دانیشتوانی شار دو ئەرکی گەورەی لە ئەستۆدا بو ، یەکەم خۆی بەخێو بکات و دووەم شان بە شانی ئەو خۆ بەخێو کردنەش ئەرکی نیشتمانـی و پاراستنی شارەکە بەرێوە ببات •

زوربەی ئەو کەسانەی لە ژورەکانا ئەمردن ، ژن یان پیاو هەریەکە لە سەر پارچە قاقەزێک شتێکیان ئەنووسی بۆ ئەوەی دوارۆژ یان نەوەی داهاتوویان لێیان تێ بگەن •

هەرکەس لە ماڵ ئەهاتە دەرەوە حەزی ئەکرد بمرێتو ئیتر نەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە ، خەڵکی حەزیان ئەکرد لە دەرەوە لەبەر روناکی دا بمرن نەك لە ژورەوە لەبەر تاریکی دا بژین .. ژیان ئەو بەها پیرۆزەی نەمابو کە مرۆڤ بۆی تێ بکۆشێ ..

شەقامەکانی شار لە زستانی ٤١ ـ ١٩٤٢ دا مردوریژ کرابو ، لە ١٥ رۆژی یەکەمی مانگی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٢ دا هەر رۆژەی پازدە هەزار کەسو لە پازدە رۆژی دووەمدا هەر رۆژەی (٣٠) سیی هەزار کەس لەبەر سەرماو برسێتیو نەخۆشی ئەمردن . لاشەی ئەو سیی هەزارەی ئەمرۆکە لە دەرەوەی ماڵەکانو لەسەر شەقامەکان ئەمردن هەروەکو خۆیان ئەمانەوەو رۆژی دواتر ، واتا بۆ سبەینێ ( ٣٠ ) سیی هەزاری تر ئەمردن بە سەریانا .

لاشەی مردوەکان وەکو پەڵەیەکی رەش لەسەر روخی شەقامەکان ئەمانەوە .. تاکو بەفر ئەباریو دای ئەپۆشین .. دوای ئەوە چینێکی تر سەر لەنوێ لەسەر بەفرەکە ئەمردو . هیچ کەس بیری لەوە نەئەکردەوە لاشەی مردوەکان کۆ بکاتەوەو بیان باتە دەرەوەی شارو بیان شارێتەوە چونکە کەس توانای ئەمکارەی نەبو .

هیچ کەس بیری لەوە نەئەکردەوە کە بەهار هاتو هەوا گەرمی کرد ، بەفرو سەهۆڵەکان توانەوە ئەم سەدان هەزار لاشەی مردوەو ـ بگرە زیاتریش ـ چۆن بۆگەن ئەکاتو ئەبێتە هۆی بلاو بونەوەی هەزاران جۆر نەخۆشی ، لەبەر ئەوەی کەس هیوای ئەوەی نەمابو تاکو بەهار دایەت بژیو نەمرێ لەسەرماو لە برسانا .

**روداوێــکی سەیر :**

رۆژێك بە سەر شەقامێکدا ئەرۆیشتم ، دوو کابرای بە ساڵا چوی ئیختیـارم دی لـە کەنـاری شەقامەکـە دانیشتبون‌و هەر یەکـەیان بە چەقۆیەك خەریکی برینی قاچی ئەویتریان بوو ، چـونکە هەروکیـان ســەرما بردبونی(۱۷) ، لەبەر ئەوەی هیوایان بە دوکتورو داوو دەرمان نەمابو ـ چونکە نەبون ـ ئەیانویست بەم هۆیەوە چەند رۆژێــکی تر بژین •

بەڵام خەڵکی کە دەست‌و قاچیان سەرما ئەیبرد نەیان ئەبڕی چونکە ئەیانزانی بڕینی دەست‌و قاچیان لە مردن رزگاریان ناکات •• ئەوانیشــ ئەیانویست بمرن‌و لەو ژیانە مەینەتاوی‌یە رزگاریان بێت •

**دیمەنیکی ناخــۆش :**

شوێنێك کە وەکو کوشتارگا وابــو ، مرۆڤ ســڵی لێ ئەکردەوە بەردەم نانەواخانەیەك بو ، رۆژانە خەڵك بۆ وەر گرتنی دەسەندەی رۆژانەی نانی خۆیان چەند سەعاتێك لەو بەر سەرمایەدا ئەوەستان‌و لەناکاو ئەکەوتن بەسەر یەکتر داو ئەمردن ••

(۱۷) سەرما بردە لە زستانی ساردا ئەبێت کە سەرماکە کار ئەکاتە سەر کەمکردنەوەی تەوژمی خوین‌و کوشتنی شانەکانی لەش ••

ئەوانەی لەبەردەم ئەو نانەواخانەیەدا ئەکەوتن‌و لە برسانا ئەمردن هەر لەوێدا ئەمانەوە ، بۆ سبەینی خەڵکی لاشەکانیان پێ کوت ئەکردن •

**پیلانێکی ژەهراوی :**

رۆژێك دەستەیەك فڕۆکەی ئەڵەمانیەکان بەئاسمانی شاردا تیەڕین‌و نانی سپی‌یان بەردایەوە ، خەڵکی بە پڕتاو رایان ئەکردو ئەیانخواردن ، ئەمەش بو بە هۆی کوشتنی خەڵکێکی زۆر لە دانیشتوانی شار ، چونکە نانەکان هەمویان ژەهراوی بون • هەروەکو بلێی سەرماو برسێتی بۆ کوشتنی خەڵکی شارەکە کەم بو ، ئەوانیش نانی ژەهراوی یان بۆ بەر ئەدایەوە •

**پیلانێکی تر :**

رۆژێکی تر دیسان ئەڵەمانیەکان جگە لە نانی سپی پاکەتی شیرینی‌و شوشە ئاوی میوەو پسکیت‌و خواردنی تریان بەر ئەدایە خوارەوە لەگەل ئەوەدا خەڵکی هەواڵی نانە ژەهراویەکانیان بیستبوو کەچی لەبەر برسێتی‌و ناچاری لەو نان‌و شیرینی‌و ئاوی میوەیانە ئەخواردو ئەوانیش وەکو دەستەی پیش خۆیان ئەمردن • زۆر کەسیش بە تایبەتی ئەو خۆراکە ژاراویانەیان ئەخوارد هەر بۆ ئەوەی بمرن‌و لەو ژیانە ناخۆشە رزگار بن •

نەمانزانی هۆی چی بو دوژمن ئیتر وازی لە

بەردانەوەی نانی ژەهراوی‌و ئەمجۆرە شتانە هێنا •

پلەی سەرمای ئەو زستانە گەیشتە پەنجا پلە لە ژێر سفرەوە(١٨) ، رادەی لە برساو لە سەرما مردوەکان گەیشتە رێژەیەك کە لە هەر هەشت کەس حەوتیان مردن ، لەم روەوە سەرژماریک نەکراوە تاکو بزانیـــن چەند کەس لە ژورا مردونو چەندەش لە سەر شەقامەکان ، بەڵام وەکو دەرکەوتووە نزیکەی ٧٠٠ ـ ٨٠٠ هەزار کەس بە تایبەتی منالآن لەناو خانوەکانا مردوون •

پێویست بە باسکردن ناکات کە ناخۆشترین مردن مردنی منالەکان بون چونکە نەیان ئەزانی لە کویێوە هاتونو بۆ کوێ ئەچن •

منالەکان لە برسانا ئەگریانو لە سەرمانا ئەلەرزین ،

ئەنجام لە باوەشی دایکیانا بە بێ ناز ئەمردن • دیـــان

لەو کاتەدا دەسەندەی نان لە روژی ٧٥ گرامەوە بو بـە پەنجـا گرام •• بەڵام نانەکە زۆر باش بو ، چونکە هیچ شتێـکی تر نەبو تێکەڵ بە ئاردەکە بکرێو ئاردەکە خراپ بکات •

لە دوەمین شەڕی جهانیدا ، تا رادەیەکو زوربەی شارەکانی ئەوروپا دوچاری کەمی ئازوخە بوبون ، وە لە زوربەی شارەکاندا بازاڕی رەشـی بۆ فرۆشتنی ئازوخە پێـك هات • هەر کەس پارەی هەبایـە ئەیتوانـی ئەوەندەی بیەوێ ئازوخەو شتومەکی خواردەمەنی بۆ خۆی بکڕێ •

---

(١٨) لە هەندیك کاتا لەو رادەیەش زیاتری ئەکرد •

بەڵام لینینگراد ، لە سەرەتای شەڕە کەدا نەبێت بازاڕی رەشی تیا نەبو ، ئەمەش لەبەر ئەوە بو کە هیچ شتێکی تیا نەبو تاکو لە بازاڕی رەشدا بیفرۆشن .

شاری ستالینگرادیش لەلای خواروی روسیەو لە

کەناری روباری « ڤولگا » ، لە ئەنجامی شەڕدا وێران

بوبو ، بەڵام کەسێک لە برسانا نەمرد تیایا .

کاتێك دەسەندەی رۆژانەی نان گەیشتە رۆژی پەنجا گرام خەڵکی ناچار بون لەبەر برسێتی دەستیان کرد بە خواردنی گۆشتی مردوەکان لە نادیو رستۆرانەکانا بە ئاشکرا کەوتنە مردو خواردن . کە ئەتوانین ئەم رستۆرانانە بە بازاڕی رەشی ئەوکاتەی لینینگراد دابنێین .

من(١٩) چومە یەکێك لەو رستورانانەو بۆ یەکەمجار گۆشتی مردوم خوارد ، لەوە بەدواوە هەمو جار بۆ خواردنی گۆشتی مردو هەر ئەڕۆیشتمەوە بۆ هەمان رستوران .

دەوڵەت زۆر بە باشی ئاگاداری ئەو رستۆرانە بو کە گۆشتی مردوی تیا ئەخورا ، بەڵام هێشتا بە رەسمی لەلایەن دەوڵەتەوە رێگا نەدرابو چونکە هێشتا دەوڵەت رۆژی پەنجا گرام نانی بە هەر یەکێك لەو خەڵکە ئەدا . ئەوەندەی پێ نەچو روژێك دەرگای هەمو نانەواخانەکان داخران و ئەو رۆژی پەنجا گرامەش لە ئارادا نەما .

---

(١٩) نوسەری کتیبەکەیە .

تا ، ئەو رۆژەی دەوڵەت رۆژی پەنجا گرام نانی بە هەر یەکێـك لە خەڵـکەکە ئەدا روخساری کۆمەڵـگایەکی شارستانیتی بە شارەکەوە دیار بو ، چونکە خەڵك هێشتا هیوایان بە ژیان مابو ، هەمو رۆژ دەســـەندەی پەنجا گرامی نانی خۆیان وەر ئەگرت . بەڵام کە ئەو رۆژی پەنجا گرامە نەما ئیتر پەیوەندی نێوان خەڵكو ژیان بچڕاو خەڵك هیچ هیوایەکیان بـە ژیان نەما .

## کۆتایی روخساری شارستانیەتو

## خواردنی گۆشتی مردوەکان

کاتێك دەسەندەی نان بڕا ، دەوڵەت هیچ ئاگاداری یەکی لەم روەوە بڵاو نەکردەوە ، هۆی بڕینی دەسەندەی نانی رۆژانەی هیچ باس نەکرد • ئەمەش بە زۆری لەبەر ئەوە بو کە نە روژنامە هەبو نە دەسگای رادیۆ •• بەڵام خەڵك زۆر باش ئەیانزانی بۆیە دەسەندەی رۆژانەی نان بڕاوە چونکە ئازوخە لە شارەکەدا نەماوە •

بەر لەوەی دەسەندەی رۆژانەی نان ببڕێت من دەستم کردبو بە خواردنی گوشتی مردوەکان ، لەبەر ئەوە دەسەندەی نان منی لە برسیتی

رزگار نەکرد ، لە کاتی بڕینی ناندا ژەهری «پتومایین»[1] وای لێکردبوم کە هیچ ئاگایەکم لە خۆم نەمابو ، چاوم بە دوکانی نانەواکان ئەکەوت هەمویان داخرابون ، بە خۆمم ئەوت :

« **خۆم بۆ مەرگ ئامادە بکەم** » • لەو باوەڕەدابوم کە تیکڕای خەڵك هەمو وەکو من بیریان ئەکردەوە •

دوای بڕینی دەسەندەی نان دەوڵەت ڕێگای خواردنی گۆشتی مردوی نەگرت ، چونکە جگە لە لاشەی مردوەکان هیچ شتێکی تر نەبو تاکو خەڵك بیخوات ••

بە داخەوە کاتێك نان بڕا سوتەمەنیش لەناو شارەکەدا تەواو بوبو ؛ ئینجا خەڵك ناچار بون لەبەر برسێتی گۆشتی مردویان بە کاڵی ئەخوارد •

من ، بە هۆی ئەوەوە لە دەزگای روزنامەنوسی‌دا کارم ئەکرد کتێبخانەیەکی گەورەی پڕ لە کتێبو گوڤارو ڕۆژنامە کۆنم هەبو ، زور جار لێم ئەسوتاندن بۆ گۆشت برژاندن ، شەوانەش لە سەرمانا بە سەرو قاچمەوە ئەپێچان •

ئەڵمانیەکان ، لە دوای تەواو بونی دەسەندەی ڕۆژانەی نان چەند شەوو ڕۆژێك یەك لە سەر یەك شارەکەیان دایە بەر گولە تۆپ ، بەو نیازەی شارەکە هەموی وێران بکەن •

---

(١) پتومایین •• جۆرە ژەهرێکە لەناو گۆشتی مردودایە •• هەر کەس ئەو گوشتە بخوات دوچاوی ئەو ژەهرە ئەبێت •

**رووداوێـــكی سەیر :**

رۆژێك بۆ هێنانی گۆشتی مردو لە ژوورەكەم چومە دەرەوە ، دەرگای ماڵی یەكێك لـــە هاورێكانم دی كرابۆوەو جوتێك چەكمەش بە حەواوە لەناو ژوورەكەدا هەڵواسرابو • كە چومە ژورەوە تەماشام كـرد خـاوەن ماڵەكـە بـە پەتێك هەڵواسراوەو لاقێ كی لێ كراوەتەوە •• زۆر سەرم ســـورما بۆ ئەبێت ئـەو كەسەی قاچی ئەم كـــابرایەی بڕیـوە ئەوەندە ئەركی كێشاوە لەو پێپلەكانانە سەر كەوتووەو ئەم پیاوە زەلامەی هەڵواسیوەو قاچەكەی بڕیوەتەوە •• خۆ هەر لە سەر شەقامەكە گۆشتـی لەمە باشترو زور تر هەبو ببیردبایە •

پەیتا پەیتاو بە گەرم دەنگی گولە تۆپی ئەڵەمانیەكان ئەهات كە بە سەر شارەكەدا ئەرۆیشتن و ئەتەقینەوە ، دەنگی روخاندنی خانو بەرەو دوكان و شوێنە نیشتەجێكان ئەهاتن ، بەلام كەسێك لە دەنگی گولە تۆپ یان فرۆكە نەئەترسا چونكە لەگەل مەترسییەكی گەورە تردا روبەرو بوبونەوە كە ئەویش سەرماو برسیتی بو ••

هەروەها ، لەبەر ئەوەی هیچ هۆیەكی گواستنەوەو هاتوچۆكردن لە شارەكەدا نەمابو ، خەڵك بە تیكڕایی لە سەر ناوەڕاستی شەقامەكـان هاتوچۆیان ئەكردو ئەكەوتن بە زەویدا ••

من ، چونكە هەندێك قاقەزی كۆن و كۆنە رۆژنامەو كتێب و گوڤارم هەبو ، ئەو هاوڕێیانەم كە ئەیانناسـیم بە تایبەتی ئەهاتن بۆ لام بۆ ئەوەی گۆشتی مردو بە قاقەزەكان ببرژێنن •

خواردنی گۆشتی مردوەکان لە سەرەتاوە خەڵك شەرمیان لێ ئەکردو زاتیان نەئەکرد ئاشکراو لەبەر چاو خەڵکی ترا ئەمکارە بکەن •• دیسانەوە بە پێی یاساش ئەمکارە کارێکی ناپەسەندانە بو •• بەڵام برسێتیو باری ناچاری کارێکی وایکرد خەڵکەکە دەقیان پێوە گرتو لەبەر چاو یەکتری‌دا لاشەی مردوەکانیان لەتو پەت ئەکرد • کاتێك سەیری شەقامەکانت ئەکرد ژنو پیاو بە چەقۆی گەورەو تیژەوە لاشەی مردوەکان ئەمدیوو ئەودیو ئەکەنو بە شوین گۆشتی مردوی قەڵەودا ئەگەرێنو لەتو پەتیان ئەکەنو ئەیانبڕن •

**هاورێ یەکم رۆژێك وتی :**

« هەر وەکو چۆن هاوین ئەو هەمو پەتاتەیە مان بە خەسار رشتو لەناومان بردن ، ئیستاش ئەم هەمو گۆشتە بە بێ دەست پێوە گرتن ئەخورێو لەناو ئەچێ ، رۆژێك دێت بۆی پەشیمان ئەبینەوە » •

**منیش بیرم لەوە ئەکردەوە :**

« لەبەر نەبونی کارەبا یەخچاڵەکان کار ناکەن تاکو گۆشتیان تیا هەڵبگیرێ •• ئەگەر بەو جۆرەش بە گورجی نەخورێت چەند رۆژێکی تر کە بەهار هاتو

هەوا گەرم بوو هەمویان بۆگەن ئەکەنو هەزاران جۆر نەخۆشی دائەخەن » •

بەشێکی زۆری خەڵکی شار بیریان لەم مەسەلەیە کردبۆوە ، بۆیە زوربەیان کەوتنە خۆ لە ژێر خانە ساردەکانا چاڵیان هەڵ ئەکەندو لاشەی مردوەکانیان تیا ئەشاردنەوەو پاشەکەوتیان ئەخستن بۆ ئەو کاتەی کە هەوا گەرم ئەکاتو گۆشتی سەر شەقامو کۆڵانەکان بۆگەن ئەکەن •

کە گۆشتی مردو خواردن بو بە شتێکی ئاسایی ئیتر ئەوەندە خەڵك لە برسانا نەئەمردن ، هەواش بەرەو خۆشی ئەچو ، لەو شارە گەورەیەدا تەنیا نەخۆشخانەیەك نەمابو ، ئەڵەمانیەکان هەمویان بە بۆمباو گولە توپ وێران کردبو •

خەڵکی ناو شار نەخۆشەکانیان لە باڵەخانەیەکی گەورەی چەند نهۆمدا کۆ ئەکردەوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی خۆراك نەبو بیاندرێتێ بە بێ خواردەمەنی ئەمانەوە خواردنی خەڵك بریتی بو لە گۆشتی مردو ، لەو کاتەدا هێشتا دەوڵەت دانی بە خواردنی گۆشتی مردودا نەنابو لەبەر ئەوە کەسێك گۆشتی مردوی بە نەخۆشەکان نەئەداو هەر لە جێگای خۆیان زیاتر لە برسانا ئەمردن •

**هاتنی فرۆکەکان :**

رۆژێك لە ناکاو گوێمان لە دەنگی فرۆکە دوپەروانەکانی خۆمان(٢) بو •• هەرچەند سەیرمان کرد لەبەر زۆریو نزمی هەورەکە هیچمان بەرچاو نەکەوت •

هەر لەو رۆژانەدا بیستمان کە فرۆکەکانی خۆمان(٣) چەند کیسەیەك خواردەمەنییان خستۆتە خواردەوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ هۆیەکی پەیوەندی کردن نەبو لەگەل فرۆکەکانا نەمانزانی لەکوێ دایان خستوە •

رۆژی دوایی دیسان هەمان جۆر گوێمان لە دەنگی چەند فرۆکەیەکی تری خۆمان(٤) بوو ، زانیمان کە دەوڵەت لە پەیجۆری رزگار کردنی شارەکەدایە •• بەڵام ئایا بە هۆی چەترەوە چۆن ئەوەندە ئازوخە ئەگات کە بەشی هەمو خەڵکی شارەکە بکات •

رۆژی ٢٩ی مانگی مارسی ساڵی ١٩٤٢ بوو کە دیسان کۆمەڵێکی تر فرۆکەی خۆمان(٥) هاتنە سەر شارەکەو چەند بەیاننامەیەکیان فرێ دایە خوارەوە ، خەڵکی بە پرتاو رایان ئەکردو بە پەلە بەیاننامەکەیان ئەخوێندەوە ، لە بەیاننامەکەدا نوسرابو :

« دەوڵەت ئاگاداری باری برسێتی شارەکەیە ، بەڵام لەبەر تەووژمی هەواو توندو تیژی شەڕی ئەڵقەی گەمارۆدانەکە ناتوانێت بە ئاسانی ئازوخە بۆ شارەکە بەرداتەوە ، بەڵام بە پێی توانا هەوڵ ئەدات ئازوخە بۆ شارەکە بنێرێ » •

---

(٢و٣و٤و٥) خۆمان ، بە مانا دەوڵەت ئەگرێتەوە •

پاش ئەو ماوە دورو درێژە کە خەڵك بە هۆی نەبونی رۆژنامەو رادیۆوە ئاگای لە دەرەوەی شار نەمابو ، بۆ یەکەمین جار هەواڵی دەرەوەیان بیستو ئاگادار بون •

بەڵام هێشتا ئەوە نەزانرا کە ژاپون لە دژی ئەمەریکاو ئینگلیز تێکەڵاوی شەڕەکە بووەو ئەمەریکاش چۆتە ناو شەڕەکەوە •

تا ئەو کاتە سێ مانگ بەسەر شەڕی نێوان ژاپۆنو ئەمەریکادا تێپەڕیبو ، کەچی ئێمە هیچ ئاگایەکمان لە مەسەلەکە نەبو ، دەوڵەت نەئیەزانی ئێمە بەو جۆرە لە وەزعی چۆنێتی دەرەوە بێ ئاگاین •

خەڵکەکە ئەوەندە برسیو بێ هیوا بون هیچ دڵیان بەو بەیاننامانە خۆش نە ئەبو •

لە سێیەمین رۆژی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤٢ دا پۆلێك فڕۆکەی تر ئازوخەیان هێنا بو ، کەچی لە ئاسمانی شاردا بەر لەوەی بارەکانیان بخەنە خوارەوە لەگەل چەند فڕۆکەیەکی جەنگی ئەڵەمانیەکانا دایان لە یەكو کەوتنە شەڕەوە • فڕۆکە روسی‌یەکان توانایان بە سەر فڕۆکە ئەڵەمانی‌یەکانا نەئەشکا ناچار رایانکرد •

ژەهری « پتومایین » کە لە ناو گۆشتی مردوەکانا بو زوربەی ژنو پیاوی شارەکەی گێج کردبو ، خەڵکەکە بێ هەست بە خۆ کردن بەسەر شەقامەکانا ئەڕۆیشتن ••

هیچ پێویست بەوە ناکات باسی پیسی شەقامو کۆڵانەکان بکەم ، خوێنەر خۆی ئەزانێت شارێکی قەرەباڵغو بێ ئاوو کارەباو بێ دەست

شۆرو ئاو دەستو بێ گەرماو بێ هۆیەکانی تری تەندروستیو بێ نـاز ئەبێ چۆن بوبێت •

شەقامو کۆڵانەکان هەمویان بوبون بە شوێنی خۆشو خاڵو ••• ئەو شارەی کە هەمیشە وەکو بوك رازابۆوەو بە خاوێنترین شـاری جیهـان ناسرابو ، بوبو بە پیسترینو بۆگەنترین شاری جیهان •

خەڵـکی شار هەمو ریشیان هاتبو ، کەسێك تاقەتی ریش تاشینـی نەمابو ، هیچ شتێکی سروشـتی کۆمەڵایەتـی وەکو خـۆی نەمـابۆوە ، روخساری شارو خەڵـکی شار بە تەواوی گۆڕابو •

خواردنی گۆشـتی مردو بە جۆرێك خەڵـکی گێـژ کردبو کـە دایك تەنانەت شیری بە منالی بەر مەمکانەی خۆی نەئەداو منالەکان لـە برسانا ئەمردن •

هـــەر منالێك ئەمرد چەند رۆژێك لەناو ژورەکانا ئەمانەوەو کـە بۆگەنیان ئەکرد ئینجا دایکەکان منالەکانیان لە پەنجەرەکانەوە فڕێ ئەدایە سەر شەقامو ناو کۆڵانەکان •

لە نیوەی مانگی نیسانی هەمان ساڵ بە دواوە هەوا بەرەو گەرمـی ئەرۆیشتو بەفرو سەهۆڵەکان بەرەبەرە ئەتوانەوە ، رۆژێك ئافرەتێـکم دی لەسـەر روخی شەقامەکە دانیشتبو منالێـکی کورپەی بە باوەشەوە بو ، بە بێ هەست کردن ئەی خست بەملاو بەو لادا ، تاکو لە ناکـاو وەکـو پارچە خۆشو خاڵێك فڕێی دایە سەر زەوی ، بە گورجی زانیم ئـەو ئافرەتە هیچ هۆشـی لای خۆی نەماوەو لێپرسراو نیە بەرامبەر بە هیـچ کردارێـکی خۆیو هەمو شارستانێتی یەکی رابوردووی لەبیر چوتەوە •

له رۆژانی چوارەمو پێنجەمو شەشەمی مانگی نیساندا دیسان فڕۆکەکان دەرکەوتنەوە ، هەندیک بەیاننامەیان بە سەر شارەکەدا بەردایەوە ، کاتێک بەیاننامەکان خوێندرانەوە دەوڵەت داوای لە خەڵکی شارەکە کردبو :

« له بەر ئەوەی فڕۆکەخانەکە لە دەرەوەی شارەو ئەڵەمانیەکان دەستیان بەسەرا گرتووە پێویستە خۆتان(٦) شوێنێك بۆ فڕۆکە خانە لەناو شاردا پاك بکەنەوە تاکو فڕۆکەکان تیایا بنیشنەوەو ئازوخەتان بۆ بێنن » .

دوای ئەوە هەوا نەختێك گەرم بو ، شارەکە بە تەواوی بۆگەنی کرد چونکە زیاتر لە سێ ملیۆن مردو لەسەر شەقامو کۆڵانو ناو خانووەکانا کەوتبون .

ئەو ئازوخەی فڕۆکەکان بەریان ئەدایەوە بەشی ژیانو گوزەرانی خەڵکی شاری نەئەکرد ، چونکە هەندیک لەو ئازوخەیە لە بەرەگای شەڕو لەسەر سەنگەری ئەڵەمانییەکان ئەکەوتنە خوارەوەو بە قسمەت نەئەبون .

رێگای چارەسەر کردنی هێنانی ئازوخە بۆ ناوشار هەر ئەوەبو لە ناو شاردا فڕۆکە خانەیەك دروست بکرێ ، تاکو فڕۆکەکان بە ئاسانی بتوانن تیایا بنیشنەوە . خەڵکەکەناچار بون تا ئەو کاتەی لە رێگای ئاسمانییەوە ئەوەندە ئازوخەیان بۆ دێت بەشی ژیانیان بکات بە ناچاری هەر گۆشتی مردووەکان بخۆن .

---

(٦) خۆتان ــ مەبەست خەڵکی شارەکەیە .　　　　ــ وەرگێر ــ

هەتا هەوا گەرمتر بوایە بۆگەنی لاشەی مردوەکان زۆرتر ئەبو ، تا ئەو رادەی لێ هات لەبەر بۆگەنی لاشەی مردوەکان هیچ کەس هۆشی لەسەر خۆی نەمابو •

کاتێك بەفرو سەهۆڵەکان توانەوە شەقامو کۆڵانەکان هەر یەکـە وەکو نیمچە روبارێـکیان لێ هات کە پڕبێ لـە خۆش‌و خاڵو لاشەی مردوەکان •



## پاك كردنەوەی شـــار
## شان بە شانی خۆ راگرتن

هەرچەند بیر لەوە ئەكەمەوە چۆن ئێمە[1] ، توانیمان ئەو هەموو لاشەی مردوانە دور بخەینەوەو شارەكە پاك بكەینەوە ؟ وەكو ئەركێـكی لە رادەبەدەر دێتە بەر چاوم •

ئەوەی كە ورەی بەرز كردبوینەوەو پاڵی پێوە ئەناین شارەكەمان پاك بكەینەوەو زیاتر خۆ راگر بین ، هەسـتی نیشـــتمان پـەروەریو خۆشەویسـتی شارو نیشتمانەكەمان بو لە دڵی هەریەك لە دانیشتوانـی شاردا • ئێمە بەو خۆراگریە توانیمان نەخشەی دوژمن وەكو نەخشـی سەر ئاو لێ بكەین ، كە ئەیویست شارەكەمان داگیر بكات •

رۆژێك چەند فڕۆكەیەكی دەوڵەت لەناو شاردا لەو شوێنەی كە كرابو بە فڕۆكەخانە نیشتنەوە ، لە هەمو ژمارەی چوار ملێون كەس لـە دانیشتوانی شار تەنیا نزیكەی پێنج سەد هەزار كەســـ لە شارەكـەدا مابونەوە •

---

(١) دانیشتوانی شارەكە •

**پاککردنەوەی شـــار :**

کاتێك بڕیار درا لاشەی مردوەکـان دور بخرێنـەوە لە هەمـــو لایەکەوە ئەو پرسیارانە هاتنە پێشەوە کە چۆن لایان بەریـن‌و بە چـی لایان بەرین‌و بۆ کوێ یان بەرین ؟ ئێمە نەمان ئەتوانی بە هۆی مەکینەی گڵ هەڵـکەندنەوە چاڵیان بۆ هەڵـکەنین‌و بیان نێژیـن چونکـە لەبـەر نەبوونی سوتەمەنی مەکینەکان ئیشیان نە ئەکرد •

ئەگەر بمان ویستبایە بە پاچ‌و بێڵ چاڵیان بۆ هەڵـکەنین دیسـان لەبەر زۆری لاشەکان‌و سەختـی زەوی کە سەرمای زستان بەستبووی بۆمان هەڵ نەئەکەندرا •

بریاردرا لاشەکان هەمو فرێ بدرێنە خەندەکە گەورەکەی دەوری شارو ، بۆ ئەوەش خەندەکەکە پڕ نەبێتەوە لە هەمو شوێنەکانی خەندەکەکەدا لاشەکان کۆمەڵ کۆمەڵ دابنرێن‌و گڵیان بە سەردا بکرێ •

لەناو شاردا هیچ هۆیەك بۆ گواستنەوەی لاشەی مردوەکان‌و دور خستنەوەیان لەناو شاردا نەبو ، چونـکە لەبەر نەبونی سوتەمـەنی هیچ ئوتومبیلێك کاری نە ئەکردو ئەسپ‌و هێستری چوار چەرخە(٢) کانیش نەمابون تاکو چوار چەرخەکانیان پێ رابکێشین ••

لە پێچکەی ئوتومبێلی کۆن‌و چوار چەرخەی بێ ئەسپ‌و تەختەو دارو ئەمجۆرە شتانە چەندان چوار چەرخەی دەستیمان دروست کـردو دەستمان کرد بە گواستنەوەی لاشەی مردوەکان بۆ ناو خەندەکەکەو دور خستنەوەیان لە ناو شار •

---

(٢) عارەبانەی ئەسپدار •

ئەوەندە بۆگەنی لاشەکان زۆر بو ، زۆر جار پیاوو ژنە ئیشکەرەکان ـ واتا ئەو پیاوو ژنانەی مردوەکانیان بە چوار چەرخە ئەگواستەوە بۆ دەرەوەی شار ـ لە کاتی بەرز کردنەوەی لاشەی مردوەکانا لەبەر بۆگەنی مردوەکان ئەبورانەوەو لە سەر خۆیان ئەچون •

هەر چوار چەرخەیەك بە پێنج شەش کەس رائەکێشرا ، لە یەکەمین رۆژی کۆ کردنەوەی لاشەی مردووەکانا ئەوە دەرکەوت کە پێویستەو ئەبێت لە پێشدا ئەو لاشانە دور بخرێنەوە کە سەر شەقامە گەورەکانیان گرتوە ، بۆ ئەوەی رێگای هاتو چۆی چوار چەرخەکانو گواستنەوەی لاشە مردوەکانی تر چۆڵ بکەن •

دوای ئەوە شەقامە گەورەکان پاك کرانەوە ئینجا دەست کرا بە پاککردنەوەی شەقامە بچوکەکانی ناو شارو کۆڵانو ناو خانوو باڵە خانەو ژێر زەمینی‌یەکان ، ژنو پیاو پێکەوە هەمو خەریکی ئەمکارە بون ، بە جۆرێك بۆنی مردوەکان کاری کردبوە مێشکی خەڵکەوە تەنانەت دوای چەند مانگێكو ـ بگرە زیاتریش ـ هێشتا بۆنی لاشەی مردوەکان لە مێشکی خەڵکی شاردا مابۆوە •

لەو رۆژەوە کە دەسەندەی نانی رۆژانە نەما ، تا ئەو رۆژەی شەڕ کۆتایی پێ هاتو سەرلەنوێ ژیان گەرایەوە بۆ ناو شارو نان دابەشکرایەوە گوێم لە دەنگی یەکێك نەبو لەناو شاردا گۆرانی بڵێت •

لە کاتی پاککردنەوەی شاردا لاشەکانمان بە چوار چەرخە ئەبردو ئەمانخستنە ناو خەندەکەکەوەو نەختێك گڵمان ئەکردن بەسەرداو دامان ئەپۆشین •• تاکو بۆگەنیان نەیەت •

کاتێك لاشەی مردوەکانمان بەرز ئەکردەوە زۆر جار وا رێ ئەکەوت لاشەی هاوڕێیەکی خۆمم ئەدی ، هیچ دڵم دانەئەچڵەکا چونکە مردن بوبو بەشتێکی ئاسایی •

شەقامەکان تا کۆتایی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤٢ هەمویان پاك کرانەوە ، هەمو لاشەکان فڕێ درانە ناو خەندەکەکەی دەوری شارو بەگڵ داپۆشران • هەر چەند شەقامەکان بەتەواوی پاك کرابونەوە بەڵام هێشتا هەر بۆگەنی لاشەی مردویان لێ ئەهات •

بە دورخستنەوەی لاشەی مردوەکانو پاککردنەوەی شار لەمردوەکان ئازوخەی ئەوکاتەی خەڵکی ناو شار بڕا(٣) ••

زۆر کەسی قایمەکار(٤) ، کە گۆشتی مردویان لە ژێر خاكو ژێر زەمینیەکانا شاردبۆوە بە هاریکاری یەکترو پێکەوە لە گەل یەکدا ئەیانخوارد •• ئەوانەش هیچیان نەشاردبۆوە دو چاری برسێتی بوبونو لە سەر شەقامەکان لە برسانا وبێ پەروا پەلاماری نە خۆشەکانیان ئەداو ئەیانکوشتنو گوشتەکانیان ئەخواردن • یان بۆ ئەوەی گۆشتەکانیان بخۆن ئینجا خەڵك بە پەلە دەستیان کرد بە گەورەکردنی فڕۆکەخانەکە لە ناو شاردا ، فڕۆکە خانەکە بە تەواوی دروستکراو گەورەکرا ، هەرچەند ئەو فڕۆکە خانە زۆر سەرەتاییانە بو چونکە هیچ پیداویستیو هۆیەکی فڕۆکە خانەیی تیا نەبو تەنیا ئەوە نەبێت فڕۆکە بتوانێتو هەر چۆن بێت تیایا بنیشێتەوە •

---

(٣) مەبەست لە خواردنی گوشتی مردوەکانە کە ئازوخەی سەرەکی ئەو کاتەی خەڵکی شاربو ٠

(٤) ئەو جۆرە کەسانەی زۆر بیر لە دوا رۆژی ئابوری خۆیان ئەکەنەوەو مشوری ژیانو گوزەرانی خۆیان ئەخۆن ٠ — وەرگیر —

فڕۆکه خانه‌که نه بورجی سه‌رکرده‌یی هه‌بو نه هه‌ماری سوته‌مه‌نی‌و نه هۆی پاریزگاری کردنی فڕۆکه‌و نه هۆی پڕ کردنه‌وه‌ی باتری یه‌کانی •

ئێمه له‌و باوه‌ڕه‌دا بوین ئه‌گه‌ر فڕۆکه‌کان بتوانن بنیشنه‌وه ئه‌توانن هه‌مو جۆره ئازو خه‌یه‌ك بۆ خه‌ڵکی شار بێنن •• به‌ڵام ، ئایا فڕۆکه‌کانی ئێمه توانای ئه‌وه‌یان هه‌بو خۆیان له فڕۆکه جه‌نگی یه‌کانی ئه‌ڵه‌مان ـ له‌ئه‌ڵقه‌ی گه‌مارۆدانه که‌ی ده‌وری‌شار ـ رزگار بکه‌ن‌و بگه‌نه سه‌ر شارو بنیشنه‌وه ؟

ئێمه بیرمان له‌وه ئه‌کرده‌وه که فڕۆکه کانی دوژمن چۆن ماوه‌ی ئه‌وه ئه‌ده‌ن فڕۆکه بار هه‌ڵگره‌کانی ئێمه بگه‌نه سه‌ر شارو بنیشنه‌وه •

به‌رژه‌وه‌ندی سه‌ربازی ئه‌ڵه‌مان وای پێویست ئه‌کرد که رێگای هیچ فڕۆکه‌یه‌کی روسی نه‌درێت به ئاسمانی شاری لینینگرادا بڕوات‌و له فڕۆکه خانه‌که‌ی ناو شاردا بنیشێته‌وه ••

رۆژی سیازده‌یه‌می مانگی مایسی‌ی هه‌مان ساڵ فڕۆکه خانه‌که به یه‌کجاری فراوان کراو ته‌واو بو • به‌ڵام نه رۆژی سیازده فڕۆکه هاتن‌و نه رۆژی دوا تریش •

ئێمه هیچ هۆیه‌کمان به ده‌سته‌وه نه‌بو که بتوانین لیپرسراوانی سه‌ره‌وه‌ی ده‌وڵه‌ت له‌باره‌ی ته‌واو بونی فڕۆکه خانه‌که‌وه ئاگادار بکه‌ین • رۆژی شازده‌یه‌می مانگی مایسی ١٩٤٢ سێ فڕۆکه‌ی بار هه‌ڵگری خۆمان هاتنه ئاسمانی شاره‌که‌وه ، پۆلێك فڕۆکه‌ی جه‌نگی پاریزگاری

یان ئەکردن • لە ئاسمانی شاردا شەڕێـکی توند لە نێوان فڕۆکە کانـی ئێمەو فڕۆکە ئەڵەمانیەکانا رویدا ، چەند فڕۆکە یەکمان کەوتنە خوارەوە ، بەڵام هەر چۆن بو فڕۆکە یەکی بار هەڵـگر لەفڕۆکە خانەکەدا نیشتەوە •

باوەڕبکەن ! وەکو چۆن لە چیرۆکە ئەفسانەیە کانا باسـی ئـەوە ئەکان ئەگەر یەکێك لە ئەستێرەی «مەریخ» ەوە بیتو(٥) بنیشێتـەوە ، چۆن خەڵك بە سەر سوڕمانی یەوە لێی کۆ ئەبنـەوەو دەوری ئـەدەنو تەماشای ئەکەن ، بەو جۆرە خەڵـکی شار بە زۆری لەو فڕۆکەیە کـۆ بونەوە •

لەو کاتەدا کەس بیری لەوە نە ئەکردەوە بزانێت ئەو فڕۆکەیە بۆ چی هاتووە ؟ بەڵـکو تەنیا ئەوەیان ئەویست فڕۆکە وانەکان ببینن بۆ ئەوەی بزانن روخساری خەڵـکی ئەودیو ئەڵقەی گەمارۆدانەکە چۆنە •• ئەو خەڵکەی لە دەوری فڕۆکەکە کۆ ببونەوە بە رواڵەت زۆر شپرزەو ریش درێژو چڵکنو بۆگەن بون •• هیچ روخسارێـکی شارستانیتـی یان بـە رواڵەتەوە نەمابو •

فڕۆکەوانەکان کە ئەو خەڵـکە بێ نازەیان بەو جۆرە دی نەیان وێرا لە ناو فڕۆکەکە بێنە دەرەوە ، وا تێ گەیشتن کە ئەو خەڵـکە هیچی مروڤی شارستانی نینو بەڵـکو هەمو روخساریان لە پیاو خۆرو دیۆو درنـج ئەچو(٦) •

---

(٥) هەر چەند روداني ئەمکارە ئیستا لە بەر مەودای حوکمی زانستدا کارێـکی سادەو ئاسانە •••

(٦) دێوو درنج نەك بەو مانایە کە لەناو چیرۆکو داستانە ئەفسانەییەکانا هاتوە ، بەڵکو بەمانا کەسانی دور لە شارستانێتیو دوا کەوتو ـ
ـ وەرگیر ـ

ئێمە ، چا وەروانی ئەوەمان ئەکرد فڕۆکە وانەکان بێنە دەرەوەو هەواڵی جیهانو ژیانی ئەودیو ئەڵقەی گەمارۆ دانە کەمان بۆ بگێڕنەوە ، بزانین لەوێ ــ واتا لەو دیو سنوری ئەڵقەی گەمارۆدانە کەوە ــ ژیانو خواردن هەیە ، یان ئاگرو سوتە مەنی هەیە کە خەڵك پێی بژین ؟ ٠ فڕۆکە وانەکان بە جۆرێك لە خەڵکەکە ئەترسان ئەگەر ترسی فڕۆکە ئەڵەمانیەکانیان نەبایە یەکسەر بەرز ئەبونەوەو بەجێیان ئەهیشتین ٠ ٠ هەرچەند ئێمە زۆرتر لە فڕۆکەکان نزیك ئەبوینەوە فڕۆکەوانەکان زیاتر لێمان ئەترسانو لە ترسانا دەمانچە کانیان دەر ئەهێنا بۆ ئەوەی خۆیانی پێ بپارێزن ٠٠ ئێمەش ــ خەڵکی شارەکە ــ هەموو مەبەستیکمان تەنیا زانینی هەواڵی ژیانی ئەودیو ئەڵقەی گەمارۆدانەکە بو ٠٠ هەرچۆن بو دەرگای فڕۆکەکەیان کردەوەو فڕۆکەوانێکیان هاواری کرد :

« ئەوە چیە ؟ چی رویداوە ؟ بۆچی بە ئارام راناوەستن ؟ » خەڵکەکە هەمو بێدەنگ بون : ئەوانەی خۆیان نوساندبو بە فڕۆکەکەوە زۆر بە ئارامیو لەسەررخۆ دور کەوتنەوە ٠

**فڕۆکەوانەکە وتی :**

« ئێوە خەڵکی کوێن ؟ بۆچی روخسارتان وای لێ هاتووە ؟ » ٠

**یەکێك لە خەڵکی شارەکە وتی :**

« ئێمە روسین ، خەڵکی لینینگرادین ، خەڵکی ئەم شارەین » ٠

**فرۆكەوانەكە وتـی :**

« باشە ، بۆچی واتان لێ هاتووە ؟ •• »

**ئینجا هەمو خەڵك بە جارێك وتیان :**

« چەند مانگە نانمان نەخواردوە ئاومان نیە ، چرامان نیە ، هیچ پێداویستی‌یەكی ژیانمان نیە ، هەمـو خزم‌و كەسو كارەكانمان‌و دۆست‌و برادەرەكانمان لەم ماوەیەدا لە برساناو لە سەرمانا مردوون » ••

**پرسیاریان لە خەڵكەكە كردەوە :**

« بۆچی مردوون » •• هەمو وتیان :

« لە سەرمانا ، لە برسانا : لەبەر نەخۆشی » •

كومەڵێك پۆلیس هاتن‌و خەڵـكەكانیان لە دەوری فرۆكەكـە دور خستەوە ئینجا فرۆكەوانەكـان داوای ئوتومێلیـان كـرد بچـن بۆ لای لێپرسراوانی شار • بەڵام پێیان وتن :

« ئوتومبیل نیە ، چونـكە سوتەمەنی نیە تاكو كاری پێ بكەن » • فرۆكەوانەكان بە پێ چون بۆ لای لێپرسراوانی شار ، لە بارەی وەزعی شارەكەوە هەمو قسەیەكیان كرد ، بە هۆی ئەو فرۆكەوانانەوە لە هەواڵی وڵات‌و دنیاو باسی شەڕەكە تێگەیشتین •• ئەو كـاتە زانیمان كە ژاپۆن پەلاماری ئەمەریكای داوە ، لـە ئەنجامدا ئەمەریكا لە رۆژ هەڵاتی دور دوچاری شەڕەكە بووە ، دەوڵەتی ئەمەریكاو بەریتانیا گەلێك زیانیان لـە

دەست ژاپۆن پێ گەیشتووە ، ئەوەشمان زانی ئەگەرچی ژاپۆن لەگەل ئەمەریکاو بەریتانیادا کەوتۆتە شەڕەوە کە دو دەوڵەتی سوێند خوارو هاو پەیمانی ئێمە بون لەو کاتەدا ـ بەڵام هێشتا دەستی بۆ ئێمە نەهێناوە •

دەوڵەتی ژاپۆن وای بیـر ئەکردەوە ئەگەر لـەم کاتەدا ـ کە ئێمە لەگەل ئەڵەمانیەکـاندا شـەڕمانە ـ ئەگەر ئەویش پەلامارمان بدات ئەوا ئێمە بە ئاسـانی لەناو ئەچین ••

ئەو کاتە دەوڵەتێـکی بە هێزی وەکو ئەڵەمان ئەبێتـە دراو سـێی ژاپۆن • کەوابو باشتر وایە ـ بۆ ژاپون ـ پەلاماری ئێمە نەدات • بـۆ ئەوەی ئەڵەمان لە وڵاتی ئێمەدا سەر نەکـەوێت • بەڵام ژاپـۆن ئـەوەی نەئەزانی کە ئێمە بە ئاسانی لەناو ناچین‌و لەو رادەیەی کە ئەو چاوەڕوانی ئەکات خۆ راگر ترین •

ئێمە لەو هەمو برسێتی‌و باری ژیانـە ناهەمـوارەدا ئامادە بوین هەمومان بمرین نەك خۆمان بدەین بە دەست ئەڵەمانەکانەوە •

فڕۆکەوانەکان بە بێ‌تەلە کانیان پایتەختیان ئاگادار کرد کە باری برسێتی‌و مەترسـی‌و مردن لە شارەکەدا چۆنە ، وە داوایان لە دەوڵەت کرد بە زوترین کات ئازوخەو سوتەمەنی‌و داوو دەرمان‌و پیداویستی‌یـە گرنگەکانی تری ژیان بنێرن بۆ دانیشتوانی شـارەکە : ئـەو فڕۆکانەی نیشتبونەوە پەتاتەو شەکرو چایان هێنا بو •

لێپر سراوانی شار پەتاتەکەیان دابەش نەکردو بڕیاریان دا بۆ چێنین چونکە زەوی‌و زارەکانی دەورو بەری شار ـ ئەوانەی هێشتا نەکەوتبونە ژێر دەسەلاتی ئەڵەمانیەکانەوە ـ هەمو بۆ کشتوکاڵی پەتاتە زۆر باش بو • چونکە ئەیانزانی تاکو فڕۆکەی ئەڵەمان بەسەر ئاسمانی شاردا بسووڕێتەوە فڕۆکە کانی ئێمە ناتوانن ئەوەندە ئازوخە بێنن بەش هەمو دانیشتوانی شارەکە بکات • لەبەر ئەوە پێویستە خۆیان خەمی خۆیان بخۆن‌و درێژە بە کشتوکاڵ بدەن • هەروەها لێپرسراوانی شار هەمو بڕیاریان‌دا فڕۆکەکان چەند جارێـک لەسەر یەك‌و بەر لە هەمو شت هەر پەتاتە بێنن بۆ ئەوەی لە کەژی بەهاردا بۆ چێنن •

دوای ئەوە بە بێ تەل هەواڵی شارو ژیانی خەڵکی شار بە پایتەخت راگەیەندرا ، دەوڵەت بڕیاری دا گۆشت‌و ئازوخەی تر بۆ شارەکە بنێرێ ، بەلام لێپرسراوانی شار لە وەلامدا وتیان

« گۆشتمان بۆ مەنیرن ، چونکە خەڵکی شار

ئەوەندە گۆشتی مردویان خواردوە لەوانەیە تا چەند

ساڵی تریش هیچ جۆرە گۆشتێکیان پێ نەخورێت »•

دوو رۆژ دوای ئەوە چەند فڕۆکەیەکی تر هاتن‌و ئازوخەیان هێنا ، بەلام هەمو جار هەر لە پێنج فڕۆکە دوانیان بە بارەوە ئەکەوتنە خوارەوە ناو خەتی گەمارۆدانەکە ـ بە هۆی ئەوەوە کە لە سەر ئەڵقەی گەمارۆدانەکە ئەڵەمانیەکان تەقەیان لێ ئەکردن ـ لە مانگی حوزیرانی ساڵی ١٩٤٢ دا بە هۆی گەرمی‌و توندو تیژی باری شەڕەکەوە لە هەمو بەرەکانی ولاتدا ئەڵەمانی‌یەکان ناچار بون هێزی هەوایی یان ـ هیزی

ئاسمانی ـ لە دەوروبەری شارەکە کەم بکەنەوەو فڕۆکە کانیان بنێرن بۆ شەڕی بەرەگاکانی تر •• بەمکارە باری خەڵکی ناو شار کەمێك ئاسان بو • ئەو کاتە فڕۆکەکانمان لە جاران باشتر ئەیانتوانی هاتوچۆ بکەن‌و لەناو شاردا بنیشنەوە •

خەڵکی شار بە گەورەو بچوکەوە دەستیان کرد بە چاندنی پەتاتە ، چەندان کێڵگەی گەورەو بچوك لە دەوروبەری نزیکی شاردا چێنرا ، هەرچەند بە هۆی نەبونی سوتەمەنی‌یەوە مەکینەی جوتکردن نەبو بەڵام بە پاچ‌و بە بێڵ زەویەکانیان ئەکێڵا •

فڕۆکەکانی ئەو سەردەمە ، وەکو ئیستا بەهێز نەبون کە بتوانن باری گەورە هەڵبگرن ، جگە لەوەی کە ئەبوا بەناو ئاگری شەڕەکەدا بهاتبانایە • هەر لەبەر ئەمەش بۆ لێپرسراوانی شار بەڵێنی نانی تەواویان بە دانیشتوانی شارەکە نەئەدا •

باری چۆنێتی شەڕەکە ئەوەی نیشان ئەدا کە زستانی داهاتوش شارەکە لە گەمارۆی شەڕ رزگاری نابێت : خەڵك هەرچی سوتەمەنی‌یان هەبو زستانی رابوردو هەمویان سوتاندبو •• تەنیا دارستانە دەوڵەتی‌یەکانی دەورو بەری شار مابونەوە کە ئەویش زوربەیان بە دەست لەشکری ئەڵەمانیەکانەوە بون • ئەگەر سوتەمەنی نەگاتە شار ، زستانی داهاتو خەڵکە کە هەمو ئەمردن لە سەرمانا •

بریار وابو ئەگەر دەوڵەت نەتوانێت ئەو ئەڵقەی گەمارۆدانە بشکێنێت ئەوا پێویستە خەڵکی شار لە لایەکەوە دوژمن بەرەو پاش ببەن بۆ ئەوەی ئەو دارستانانەی کە ئیستابەدەست دوژمنەوەن بکەوێتەوە دەست خەڵکی

شارو بیکەن بە سوتەمەنی زستانی داهاتویان تاکو لە سەرما ناو لە برسانا نەمرن •

لە روژی ١٥ی مانگی ئابی سالی ١٩٤٢ سوپای بەرگری‌و داکۆکی کاری شارو خەڵـکی شار بە گەورەو بچوکەوە پەلاماری لەشـــکری ئەڵەمانیە کانیان داو چەند کیلۆ مەترێك لە کەناری شار دوریان خستنەوە و ئەو بێشەو باخ‌و دارستانانەی لە نزیك شارەوە بون کەوتنـەوە دەســـتی سەربازو خەڵـکی شارەکە •

خەڵـکەکە بە دەستاوبردو ئازایانە دارەکانیان بڕی‌و هەمویان بەکۆڵ هێنایە شارەکەوە ، لە ماوەیەکی کەمدا ئەوەندەیان دار هێنـا کە ئەتـووت بەشی هەمو زستان ئەکات •

خەڵـکی شار بەزۆری بیریـــان لەوە ئەکـردەوە هەندێـك لـەو کارخانانەی کە بە ئاگری خەڵوزی بەرد کاریان ئەکرد بەدار بیانخەنـەوە کار •



## چەند پەلامارێکی ژێر کەوتوانەی ئەڵەمانەکانو گەڕانەوەی روخساری ژیان بۆ ناو شار

### ـ کۆتایی شــــەڕ ـ

کاتێك پەلاماردانی ئەڵەمانیەکان دەستی پێـکرد هەمو ئەو کەسانەی نواناى پەلامار بردنیان هەبو بۆ سەر ئەڵەمانیەکان ئامادە بون ، هەندێـك چونە ناو سەنگەرەوە ، هەندێـکیش سەنگەری تازەیان دروستکرد .. ئێمە بە پێی تاقیکردنەوەی رابوردو ئەوەمان ئەزانـی کە ئەڵەمانیەکـان ناتوانن لە خەندەکەکە بپەڕنەوە بۆ ناو شار ، بەڵام ـ لە گەل ئەوەشدا ـ بەوە دەســخەڕۆ نەبوین ، لە ناو شـاردا گەلێك ســـەنگەرمان لەســـەر شەقامەکانو کۆڵانەکاندا دروستکرد ، بۆ ئەوەی ئەگەر ئەڵەمانیـەکـان هاتنە ناو شارەوە سەنگەر بە سەنگەر بەرگیرییان لێ بکرێ .. چونکە ئێمە هەر لە سەرەتای شەڕەکەوە ئەو بڕیارەمان دابو ئەگـەر هەمومـان بکوژرێین خۆ نەدەین بە دەستەوە .

ئەو گولە تۆپانەی دوژمن ئێمەی نە ئەترسان ، چونکە ئێمە بەر لەو کاتە ئەوەندە سەمەرەی تاڵمان بە سەردا هاتبو هەرگیز لە گولە توپ نە ئەترساین •

ئەڵەمانیەکان چەند جارێک پەلاماریان داین : ئەیانویست بێنە ناو شارەوە ، بەڵام ئێمە خۆراگرانە بەر هەڵستیمان ئەکردن ، ئێمە دو کارخانەی کارەبامان بەدار خستە کارکردن ، بەو هۆیەوە کارمان پێشتر کەوت •• ئەڵەمانیەکان هەفتەیەك لە سەر یەك شەوو رۆژ پەلاماریان ئەهێنا • دو جار ویستیان بە چەتربازی پشتمان لێ بگرن ، بەڵام ئێمەهەردو جارەکە سەربازە چەترەوانە کانمان ئەکوشتو چەندکەسێکمان لێ بەدیل گرتن • گەلێك زانیاریمان لە بارەی شەڕو جۆری چەكو چەندایەتی ئەڵەمانیە کانەوە لە دیلەکان وەرگرت •

**دیلەکان ئەیانووت :**

ساڵی پارەکە ، سێ لەشکر بوین ، بەڵام ئێستا ژمارەمان کەم بۆتەوە ، زوربەی هێزە کانمان رویشتن بۆ بەرەگاکانیتر بۆ شەڕکردن •

لە سەرەتای زستانی ساڵەکانی ٤٢ ـ ١٩٤٣ دا ئەڵەمانیەکانو فنلندی‌یەکان زیاتر لە ٢٠ بیست لەشکریان لە دەورو بەری شار هەبو ، چوار لە شکریان هینی فنلندەو شازدەشیان ئەڵەمانی بون •

بەداخەوە ، کە ئێمە لەشکری زرێدارمان نەبو ، واتا تانگو زرێلیو چەکی قورسمان نەبو •• ئەگەرنا ئەمانتوانی لە شار بچینە دەرەوەو ئەو ئەڵقەی گەمارۆدانە بشکێنین •

زستانی دووەم هەرچەند هێشتا گەمارۆدرا بوین ، بەڵام بەهۆی بونی کارەباوە دەزگای رادیۆمان کاری ئەکردو هەمو هـەواڵێـکی دەرەوەی شارو جیهانمان ئەزانی •

بە هۆی رادیۆی لەندەنەوە هەواڵمان زانـی کەهاو پەیمانەکـــان لەشکری خۆیان گەیاندۆتە ئەفەریقاو لەوێ بەرەگایەکی تری شەڕیان دا مەزراندوە • هەروەها بە هۆی رادیۆوە هەواڵی بومبارانـی شـــارەکانی ئەڵەمانیای رۆژ ئاوامان ئەزانی بە تایبەتی شارە سنعەتی‌یەکانیان •

هەندێك جار هەواڵمان وەر ئەگرت ، گوایە هــەندێك شەو هێزی ئاسمانی ئینگلیز حەوت سەد تا هەشت سەد هەندێـك جاریشـ هــەزار فڕۆکەی بۆمبا هاوێژی ناردۆتە سەر شارەکانی ئەڵەمانیای رۆژ ئاوا •

لە رادیۆی لینینگرادەوە هەمو جار هەواڵمان بە پایتەخت ئەگەیاندو هەواڵیشمان لێ وەر ئەگرتەوە •• ئەیانووت لەکاتـی شـــەڕدا نابێـت ئیستگەکان کار بکەن نەوەك دوژمن بیدۆزێتەوەو بێ شکێنێ ، بەڵام ئێمە کارمان هەر پێ ئەکردن •

لە زستانی ساڵەکانی ٤٢ ـ ١٩٤٣ دا لەشکری ئەڵەمان چەند جارێك شارەکەیان بۆمباران کرد ، لە هەمان زستانا ســـوتەمە نیمان زۆر بو لەو روەوە بێ خەم بوین •• لەگەل ئەوەشدا زستانەکەوەکو ساڵی رابوردو سارد نەبو ، ئەو ساڵە هیچ کەس نە لە سەرماو نە لە برسانا نەمردن ، بەڵام ئاوی خواردنەوەمان زۆر کەم‌بو ، هەر وەکو ساڵی رابوردو بە فرمـان ئەخواردو بەفرمان ئەتواندەوە •

## مـژده :

رادیۆی پایتەخت مژدەی‌دا کە لە خوارووی ولاّتدا لەشـکرێـکی گەورەی ئەڵەمان خۆی داوە بە دەستەوەو لە هاوینی دا هاتودا هەمو ئازو خەیەك بە رێگای زەمینی‌دا ئەگاتە شارەکان •

ئازەوخـە بە جۆرێـك ئەگەیشـــتە لامان ئەبـوا ئەو ئابلۆقـەی گەمارۆدانەی ئەڵەمانیەکان بشکێتو رێگاکە بکرێتەوە ، ئینجا بە ئەندازەی پێویست ئازوخە ئەگاتە ناو شار •

ئێمە بیرمان لەوە ئەکردەوە کە دەوڵەت ئەیەوێ لە هاوینی داهاتودا ئەو ئەڵقەی گەمارۆدانە بشکێنێ ، باری چۆنێتی بەرەگاکانی شەڕ لە لایەن هێزەکانی خۆمانەوە لە هەمو لایەك باش بوبو تەنیا لای ئێمە نەبێت •

لە خوارووی ولاّتدا هێزی دوژمن لەناو چوو بوو ، ئەوەی مابـۆوە خۆی دابو بە دەستەوە • لە ناوەراسـتی ولاّتیشدا سپای ولاّت لەشـکری ئەڵەمانی بەرەو دواوە ئەشکاندەوە ، ئێمەش بە هیوا بوین کە هاوینی داهاتو گەمارۆ دانەکەمان نەمێنێ •

لە بەهارو هاوینی ساڵی ١٩٤٣دا هەر وەکو ساڵی رابـوردو پەتاتـەو ماشمان ئەچاند بۆ ئەوەی بۆ زستان ئازوخەمان هەبێت ، هەر وەها دارمان کۆ ئەکردەوە بۆ ئەوەی زستان سەرمامان نەبێت •

## هەوالیـکی خۆش :

لەهاویندا هەواڵێکی زۆر خۆشمان پێگەیشت کەپەلامـــار بردنی ئەڵەمانیەکـــان لـە ناوەندی ولاّتدا شکاوەتەوە ، ئەمە دوایە لامـــاری

ئەڵەمانیەکان بو لـــە وڵاتدا • دوای ئەوە لەشکرەکانی ئەڵەمان توانای پەلامار دانیان نەما ، تا ئەو کاتەی بەرلین خۆی دا بە دەست لـە شـــکری هاو پەیمانەکانەوە •

ئەڵەمانیەکان لە بەرەگای شەڕی « کورسك بیلگورود»دا لە هاوینی ساڵی ١٩٤٣ دا چوار هەزار تانگیان بەکار هێنا بو(١) •

لە کاتی گەمارۆدانەکەدا ، لە سەرەتادا سەربازەکانی وڵات کـــە داکۆکییان لەسەر شارەکەمان ئەکرد ئازوخەیان هەبو ، بەڵام لە دوایدا ئەوانیش بێ ئازوخـــە کەوتن و وەکو خەڵـکی شار دەستیان کرد بـــە خواردنی گۆشتی مردوەکان •

خەڵـکی شار هەندێك لولەی ئاویان چاك کردەوە بەو هۆیـەوە ئاو ئەگەیشتە هەندێك لـە گەڕەکەکانی شار •• رۆژێك کە بەفر ئەباری لەبەری رۆژ هەڵاتی شارەکەمانەوە دەنگی دەستڕێژو تۆپو شـــەستیر ئەهات ، رادیۆ بڵاوی کردەوە کـە سپای وڵات بە درێژایی دەریاچـەی « لادوگا »کـە کەوتۆتە بەری رۆژ هەڵاتی شارەکەوە پەلاماری لەشکری ئەڵەمانی داوە بۆ ئەوەی شارەکە رزگار بکات •

ئێمە کـە ئەم هەواڵەمان بیست دەمو دەس کـەوتینە
خۆ ، لـــە پشتەوە پەلاماری لەشـکری ئەڵەمانمان داو
لەشکری ئەڵەمان کەوتە نێوان دو ئاگرەوە •

---

(١) ئەم ژمارەیە بۆ ئەوکاتە گەلێـك زۆر بووە • — وەرگێر —

لــــه یەکـەمین ڕۆژەکانی ساڵی ١٩٤٤دا سوپای وڵات لەبەری ڕوژهەڵاتو ئێمەش لە ناوەوە پەلاماری ئەڵەمانیەکانمان داو لەشـــکری ئەڵەمانمان شکاندو چاومان بە بینینی سپای وڵاتەکەمان رون بۆوە •

کــــە ڕێـگا کرایەوە، ئازوخــــە گــــەیشتە شارو بــە گورجی نانەواخانەکان دەستیان کرد بە نان کردنو هـــەر کەس هـــەر ڕۆژێ دەسەندەی تەسەلی نانی خۆی وەر ئەگرت •

باری ژیان جارێـکی تر ئاسایی بۆوە ، دەوڵەت بڕیاری دا پۆستە بە پۆستە خەڵـکی شارو ئەو سەربازانەی لـە شارەکەدا بون بیـان نێرن بۆ ناوچەکانی تر بۆ ئەوەی بێنەوە ســەر خۆ : چونـکە خـۆ ڕاگرتنی (٣) سێ ســاڵو خواردنی گوشتی مردوو سەرماو سۆڵەو هەزاران جۆر نەخۆشی بە جۆرێك کاری کردبوە ســەر روخساری خەڵکی شارەکە ، کــە بە ئاشکرا شێتیو ماندوێتیو نەخۆشی لە ڕواڵەتیانا بەدی ئەکرا •

زۆری پێ نەچـــو لەشکری ئەڵەمان بـــە شپرزەییەوە دەوری شارەکەی بەجێ هێشتو بە یەکجاری گەڕایەوە •



# فەرهەنگۆك

**ئەو وشانەی وشەی تریان لە جێگادا دانراوە ئەمانەن :**

ئانو تول داروف ـ مـــن

لینینگراد ـ شارەکە

روسیا ـ وڵات

بەریتانیا ـ ئینگلیز

دەوڵەت ـ خۆمـــان

نیسان ـ ئابریل

حزیران ـ ژوئن

تەموز ـ ژوئیە

مایس ـ مـەی

ئاب ـ ئاوت

خەڵـکی شار ـ ئێمـە

# پێرست

**بەشی سێیەم :**



**بەشی چوارەم :**

## سوپاس :

زۆر سوپاسی برایانی هونەرمەندو خۆشنوس کاك نەوزاد توفیق‌و کاك ئەحمەد سەعید ئەکەم ناونیشانی کتێبەکەیان بۆ نوسیم •

- وەرگێر -

